# شەوە سپییەکان



دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی

زنجیرەی رۆشنبیری

*

**خاوەنی ئیمتیاز: شەوکەت شێخ یەزدین**

**سەرنووسیار: بەدران ئەحمەد حەبیب**

* * *

ناوونیشان: دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس، شەقامی گوڵان، هەولێر

فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی

# شەوە سپییەکان

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە:

سۆران مستەفا حسێن



ناوی کتێب: شەوە سپییەکان – ڕۆمان
نووسینی: فیۆدۆر دۆستۆیڤسکی
وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە: سۆران مستەفا حسێن
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٧٩٠
هەڵەگری: شێرزاد فەقێ ئیسماعیل
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
بەرگ: مریەم موتەقییان
چاپی یەکەم، هەولێر– ٢٠٠٨
لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان لە هەولێر ژمارە ١٦٦٧ی ساڵی ٢٠٠٨ی دراوەتێ

# شەوی یەکەم

ئەو شەوە، شەوێکی زۆر خۆش بوو، خۆشەویستان شەوی لەو جۆرە تەنها ئەو کاتانە هەستی پێدەکەین کە گەنجین. ئاسمان پڕ ببوو لە ئەستێرە، زۆر درەوشاوە کە تەماشات دەکرد نەتدەتوانی پرسیار لەخۆت نەکەی کە ئاخۆ چۆن خەڵکانی مەزاج نەخۆش و دەمدەمی و کەسانی بێبار لە ژێر ئەم ئاسمانە جوانەدا دەژین؟! خۆشەویستان ئەم پرسیارە پرسیارێکی زۆر گەنجانەشە، بەڵێ زۆر گەنجانە بەڵام لەوەیە خوا ئەو پرسیارە زیاتر بخاتە دڵتەوە!. بۆ قسەکردن لەسەر کەسانی بێبار و مەزاج دەم دەمی ناتوانم تەواوی حاڵەتی ئەو ڕۆژەم بەیاد بهێنمەوە، هەر لە بەیانی ئەم ڕۆژەوە تووشی داڕووخانێکی دەروونی





زۆر سەیر هاتبووم، تا وام لێهات هەست بکەم کە تەنیام، یا هەست بکەم هەموو خەڵکی لێم دووردەکەونەوە و ڕادەکەن، بێگومان هەر کەسێکیش سەرپشکە لەوەی باسی"هەموو خەڵک"بکات. هەرچەندە نزیکەی هەشت ساڵ بوو لە "پترسبۆرگ"دا دەژیام کەچی بە دەگمەنیش ئاشنایەکم نەبوو، بەڵام من چیم دابوو لە ئاشنا؟ لەکاتێک ئاشنایەتیم لەگەڵ تەواوی "پترسبۆرگ" دا هەبوو، لەبەر ئەوەش بوو کاتێک کە تەواوی خەڵکی شار بارگەیان کۆدەکردەوە و بۆ بەسەربردنی پشووی هاوینەیان لە ڤیلاکانی دەرەوەی شار هەستم دەکرد هەموویان بەجێم دێڵن، هەستم بەترس دەکرد لەوەی کە بەتەنیا دەمامەوە، بۆ ماوەی سێ ڕۆژی تەواو لە بێ هیواییدا لە شاردا دەسووڕامەوە، سەرگەردان لەگەڵ خۆمدا نەمدەزانی چی بکەم! کاتێ کە پیاسەم دەکرد لە "ناوڤسکی"دا یا دەڕۆیشتمە باخچەکان یا دەچوومە سەر پردەکە، هیچ سیمایەکم نەدەبینی لەو سیمایانەی کە لە هەمان کات و سات و شوێندا خووم بەبینینیانەوە گرتبوو و هۆگریان ببووم، بێگومان ئەوان منیان نەدەناسی، بەڵام من ئەوانم دەناسی، زۆر بە هۆگرییەوەش ئەوانم دەناسی، خەریکە بڵێم هەموو ڕوخسار و سیماکانیانم ئەزبەر کردبوو، ئێستاش دڵخۆش دەبم کاتێک بزانم ئەوان ڕوو گەشاوە و دڵخۆشن، خەمباریش دەبم کە بزانم ئەوان لەژێر گومان و دوودڵیدان. وەکو هاوڕێیەتیش، تەنها کەمێک هاوڕێیەتیم لەگەڵ پیاوێکی بەتەمەندا هەیە، کە هەموو ڕۆژێک لە یەک کاتژمێری دیاریکراودا لە "فۆنتانا" دەیبینم، لەشێوەی دەموچاوێکی تێگەیشتووی قووڵ کە هەمیشە لەبەر خۆیدا ورتەورت دەکات، دەستی چەپی هەڵبەز و دابەز پێ دەکات، لە لەکاتێکدا بەدەستی ڕاستیشی گۆچانێکی

سەرک زێڕینی هەڵگرتووە و پێی دەڕوات، بگرە تێبینیشم دەکات و زۆر کەیفیشی پێم دێت، ئەگەر وا ڕێکەوت کە من لەهەمان کاتی دیاریکراودا لەو خاڵە نەبم کە هەمیشە لێیەوە چاومان بەیەکتری دەکەوێت، ئەوا دڵنیام ئەو هەست بەبێ ئومێدی دەکات، ئیدی کە بەیەکتری دەگەین سەری ڕێز بۆ یەکتری دادەنەوێنین، بەتایبەتیش کە هەردووکمان لەبارێکی خۆش و ئاسوودەدا بین، ڕۆژی پێشووتر کە بۆ ماوەی دوو ڕۆژ بوو یەکتریمان نەبینیبوو، دوای ئەوەی ڕۆژی سێیەم یەکتریمان بینی، هەردووکمان دەستمان خستە سەر کڵاوەکانمان وەک ڕێزێک بۆ یەکتری، بەڵام لەهەمان کاتدا دەستمان داگرتەوە و بە تەنیشت یەکتریدا بە لەیەکتر ڕوانینێکی دڵخۆشانە تێپەڕبووین.

لەگەڵ ئەمانەشدا خانووەکانیش دەناسم، کاتێ بەلایاندا تێدەپەڕم وەک ئەوە وان لە شەقامەکاندا بەدوامەوە بن و لە یەکە یەکەی پەنجەرەکان بیانەوێ تەماشام بکەن، یان وەک ئەوەی بیانەوێ پێم بڵێن: "چۆنی؟ بەیانیت باش، ئێمە باشین، سوپاس بۆ خوا چیرۆکێکی نوێمان پێیە بۆ مانگی پێنج"، یا بڵێن " چۆنی؟ بەیانی دووبارە شێوەیەکی دیکە دەگرینە خۆ"، یان بیانەوێ بڵێن:" ئێمە خەریک بوو خاپوور ببین و ترسێکی زۆرمان هەبوو"، ئیتر بەم جۆرە ئارەزووم لەگەڵیاندا هەیە و هەست بەخۆشی دەکەم لەنێویاندا، هەندێکیان هاوڕێی بەڕێزی منن، یەکێکیان نیازی وایە لەگەڵ ئەندازیارێکی بیناکاری سەودا و کاری هەبێت لەم هاوینەدا، هەموو ڕۆژ بەمەبەست بەلایدا تێدەپەڕم تا بزانم نەوەک کاری نۆژەنکردنەوەی هەرەسی هێنابێت، خوانەکا! بەڵام هەرگیز ئەو ڕووداوە لەیاد ناکەم کە لەگەڵ خانوویەکی زۆر جوانی ڕەنگ پەمەیی کاڵدا ڕووی دا، کە خانوویەکی





لە کەرپووچ دروستکراوی دڵکراوە بوو و زۆر میوان دۆستیش بوو بەرامبەر بەمن، جێگەی شانازی بوو لە نێو خانووی دراوسێ شڕو شیتاڵەکانیدا، کاتێک کە ڕێم بەلایدا دەکەوت دڵم پێ دەکرایەوە، تا لەناکاو لە هەفتەی ڕابردوو بە ڕێگادا دەڕۆیشتم تەماشای ئەم هاوڕێیەم کرد، دەنگێکی خەمناکم لێ بیست"بە بۆیەی زەرد ڕەنگم دەکەن!"، ئەم بێبەزەییانە، ئەم بەربەرییانە! هیچ شتێکیان نەهێشتبۆوە، نە ستوونێک، نە تارمەیەک تا بە ڕەنگی زەرد بۆیەی نەکەن، هاوڕێ بەستەزمانەکەشم وەک بولبولێکی کەناری ڕەنگ زەردی لێ هاتبوو، منیش خەریک بووم تەواو لە بێ ئومێدیدا نەخۆشی زەرتک بگرم، لەو ڕۆژەوە ئازایەتی ئەوەم نەما سەردانی ئەو هاوڕێیە شێواوەم بکەم. ئەزیزان جا ئێستا ئێوە تێدەگەن بە چ جۆرێک من ئاشنایەتیم لەگەڵ هەموو " پترسبۆرگدا " هەیە!

بەر لە ئێستا ئاماژەم بەوە کرد کە سێ ڕۆژی تەواو نیگەران بووم، بەر لەوەی باسی ئەوەتان بۆ بکەم کە چی بۆتە هۆی ئەوەی کەوا نیگەران و نائاسوودەبم، کە لە شەقامەکاندا گوزەرم دەکرد هەستم بەشەرمەزاری دەکرد (ئەمەیان واچوو ئەوەیان واچوو، ئەی ئەوەی تریان چی؟)، لە ماڵەوەش بە هەمان شێوە هەستم بە باشی نەدەکرد و لەسەرخۆم نەبووم، بۆ دوو ئێوارە مێشکم قاڵ دەکرد بەبیرکردنەوە لەوەی چ نارێکییەک و هەڵەیەک لە سووچی ژوورەکەمدا هەیە، بۆچی تێیدا ئەوەندە هەست بەنائارامی دەکەم؟ بەسەرسوڕماوییەوە لە پەڵە و لەکە سەوزەکانی سەر دیوارەکانی ژوورەکەم ورد دەبوومەوە، لە بنمیچی ژوورەکەم کە بەتەونی جاڵجاڵۆکە تەنرابوو و لەبەر فەرامۆشییەکانی "ماترۆنا"ی خزمەتکار زیاتر ببوون. تەماشای یەک

بەیەکی کەلوپەلی ژوورەکەم دەکرد، لە کورسییەکان ورد دەبوومەوە کە ئایا هیچ گرفتێک لەدانانیان هەیە "چونکە ئەگەر کورسییەک لە کورسییەکان وەک ڕۆژی پێشتر لە شوێنی خۆی نەمابوایە، ئەوا ئیتر من خۆم نەدەبووم!" سەیری پەنجەرەکانم دەکرد بەڵام هەموویان بێ هوودە بوون... کەمێکیش چییە پێیانەوە باشتر نەبووم! تا ئەوە بەمێشکمدا هات بەدوای "ماترۆنا"ی خزمەتکار بنێرم و چەند ئامۆژگارییەکی باوکانەی بدەمێ لە بارەی تەونی جاڵجاڵۆکەکان و تەمبەڵییەکەشی، بەڵام کاتێ کە هاتە ژوورەوە، بەسادەیی و سەرسوڕماوی چاوی لێ موورِ کردمەوە، دواتر بێ ئەوەی وشەیەک بڵێ چووە دەرەوە، لەو ڕۆژەدا تەونی جاڵجاڵۆکەکان بە ئارامی لە شوێنی خۆیان هەڵواسراو مانەوە، من لەکۆتاییدا تێگەیشتم هەڵەکە لە چی دابوو. ئاخ! لەبەر چی هەموو خەڵکی دەڕۆیشتن بۆ بەسەربردنی پشووی هاوینەیان لە ڤێلاکانی دەرەوەی شار؟! منیشیان بە بەرەڵاکراوی بەتەنیا جێ دەهێشت؟! بمبوورن بۆ بێمانایی وشەکەم کە دەڵێم "بە بەرەڵاکراوی" لەبەرئەوەی زەوقی بەکارهێنانی زمانێکی پاک و پاراوم نییە... چونکە هەموو شتێک کە لە"پترسبۆرگ"دا بوو ڕۆیشتبوو یان لەڕێگادا بوو بۆ ڕۆیشتن، بۆ پشوودان لە ڤێلاکان، هەر کابرایەکی خانەدان و بە ویقارِت بدیبایە ئەوا خەریکی ڕاگرتنی تاکسییەک بوو دەڕۆیشت و بەڕێ دەکەوت، سەرپەرشتیاری هەر خێزانێکم بدیبایە کە پیاوەکەیە، کاتێ لە ئەرکی ڕۆژانەی تەواو دەبوو دەگەڕایەوە بۆ باوەشی خێزانەکەی بۆ خۆئامادەکردن بۆ ڤێلاکانی شار، هەوایەکی تەواو سەیریش هەبوو بۆ ئەو ڕێبوارانەی کە بەوێدا تێدەپەڕین کەوا دیار بوو بەهەر یەکێکیان بڵێ: (بەڕێزان، ئێمە بۆ





چەند ساتێک لێرەین و بۆ دوو کاتژمێری تر ئێرە جێ دێڵین و بۆ ڤێلاکان دەڕۆین). ئەگەر پەنجەرەیەک بە چەند پەنجەیەکی سپی ناسک و جوان بکرابایەوە و لەودیوی شووشەی پەنجەرەکەوە سیمای کچێکی جوان دەربکەوتایە و داوای چەپکێک گوڵی لە عارەبانەی گوڵفرۆشی سەر شەقامەکەی بکردایە، ئەوا هەر زوو دەمزانی کڕینی ئەم گوڵانە بۆ جوانییەکەیان و خۆشی بەخشینەکەیان نییە لە نێو خانووی دانیشتووە شڕەکانی شاردا، بەڵکو بۆ ئەوەیە تا هەر زوو لەگەڵ خاوەنەکانیان شار چۆڵ بکەن و بڕۆن بۆ دەرەوەی شار. لەوەش زیاتر ئەوەبوو، کە هەندێ شتی سەیرم بۆ خۆم بەردەست کردبوو، ئەویش ئەوەبوو کە دەمتوانی بەتەواوی جیاوازی لە نێوان ئەو کەسانەدا بدۆزمەوە بەوەی کە هەریەکەیان لە چ جۆرە ڤێلایەکی دەرەوەی شار پشوویان بەسەر دەبەن، نیشتەجێبووەکانی ڤێلاکانی "کامینی و ئاپتیکارسکی "، یا "پیتەرهۆف ڕۆود " بەوە دیاربوون کە ڕەفتاری قۆز و کەشخەیان لێ بەدی دەکرا، یا بە هۆی جل و بەرگە سەردەمییە هاوینییەکانیان و ڕەنگی ئەو ئەسپ و گالیسکە جوانانەی کە بۆ شارۆچکەکان لێیان دەخوڕین، دیاربوون. گەشتیارەکانی "پارگۆلۆڤۆ" و شوێنە دوورترەکان، یەکسەر بە یەکەم نیگا بە هۆی ویقارِ و ماقووڵییەتەکەیان دەکەوتیتە ژێر کاریگەرییانەوە. سەردانکەرەکانی دوورگەی " کریستۆڤسکی" بەهۆی سیما دڵخۆش و گەشەکانیان دەناسرانەوە. ئەگەر ڕیزە عارەبانچییەک بە بەرچاوم کەوتبایە، کە بە خۆیان و جڵەوی ئەسپەکانیش بە دەستیان لە تەنیشتی عارەبانەکان بوونایە، لەگەڵ هەڵگرتنی چیایەک لەکەلوپەلی ناو ماڵ، وەک مێزو کورسی و قەنەفە و کەنتۆڕ لەسەر پشتی عارەبانەکانیان، ئەوا دەمدیت

وا پاسەوانی لەو کەلوپەل و ماڵ و سامانە دەکات وەک ئەوەی بینایی چاوەکانی بێت، یا ئەگەر چەند بەلەمێکم بدیبایە کە بارێکی گرانیان لێ بار کراوە لە کەلوپەلی ناو ماڵ و هێدی هێدی لە "نیڤا " یا "فۆنتانا " هەڵدەکشێ بۆ " بلاک ریڤەر" یا بۆ دوورگەکان ئەوا بە بەرچاوی من وا دیار بوو کە عارەبانە و بەلەمەکان دە قات و بگرە سەد قاتی خۆیان شتیان لێ بار کردبوون، وا هەستم دەکرد کە هەموو شتێک لە جووڵان و ڕۆیشتندایە، هەموو شتێک لە ڕێگەی کاروانە ئاساییەکانەوە بۆ ڤیللاکانی دەرەوەی شار دەڕۆیشتن، دەتگوت "پترسبۆرگ " هەڕەشەی لێ کراوە بۆ ئەوەی ببێتە بیابان، بۆیە لەکۆتاییدا هەستم بە شەرمەزاری و ترس و خەمباری دەکرد لەوەی کە من هیچ شوێنێک نییە لێی پشوو بدەم و بۆی بڕۆم. من ئامادەبووم لەگەڵ هەموو ئەو عارەبانچی و هەموو ئەو پیاوە خانەدانانە بچمە دەرەوە بەڵام هیچ کەس (بە دڵنیاییەوە هیچ کەس) منی بانگهێشت نەدەکرد، وادیارە منیان لەیاد کردبوو، یا وەک ئەوەی من بەڕاستی لە ناویاندا غەریبە بم.

ئەو ڕۆژە هەروەک عادەتم پێ گرتبوو پیاسەیەکی دوور و درێژم کرد، بە تەواوی خۆم لەیاد کردبوو کە لە کوێم، هەر ئەوەندە خۆم بینییەوە وا لە دەروازەکانی دەرەوەی شارم، یەکسەر هەستم بە دڵکرانەوە کرد، لە دەروازەکە تێپەڕیم و ڕۆیشتمە ناو کێڵگە کشتوکاڵییەکان و شوێنە سەوزاییەکان، لەبەر شەکەتی شار هۆشم لەسەرخۆم نەمابوو، هەست و بیرم لەدەست دابوو وەک ئەوەی خەمی دونیا کەوتبێتە سەر ڕۆحم، هەموو ئەو ڕێبوارانەی کە بەوێدا تێدەپەڕین بە شێوەیەکی هاوڕێیانە لێیان دەڕوانیم، دەتگوت سڵاوم لێ دەکەن، هەموو پێیانەوە دیاربوو لەشتێکەوە دڵخۆشن، هەموویان جگەرەیان دەکێشا، منیش هەستم





بەدڵخۆشییەک دەکرد کە هەرگیز پێشتر هەستم پێ نەکردبوو، وەک ئەوە وابوو لەپڕ لە ئیتاڵیا خۆم دۆزیبێتەوە، کاریگەری سروشت زۆر بەهێز بوو لە سەر کابرایەکی لادێیی نەخۆشی وەک من، کە خەریک بوو لە نێوان دیوارەکانی شاردا بخنکێم.

شتێکی هەست بزوێنی دەرنەبڕدراو لە سروشتی دەوروبەری" پترسبۆرگدا "هەیە، کاتێ بەهار نزیک دەبێتەوە، سەراپای خۆی دادەپۆشێ بەو هەموو دەسەڵات و توانایەی کە لە لایەن خواوە پێی بەخشراوە. کاتێ کە گەڵا دەردەکات، سەراپای خۆی دەڕازێنێتەوە، خۆی بە تارای گوڵین دادەپۆشێ..... بەجۆرێک ناتوانم کچێکی لاوازو بێ هێزی ڕەقەڵە بە بیر خۆم بێنمەوە، کە هەندێ جار ناتوانی لەگەڵ ئەو جۆرە کەسانە هەست بە بەزەیی و دڵسۆزی و خۆشەویستی نەکەی، هەر ئەوەندە لەکاتێکدا بێئاگایانە هەست بەوە دەکەی (وەک ئەوەی بە ڕێکەوت) ئەو بۆتە کەسێکی کاریگەر و جوان و مەستکەر لەژیانی تۆدا، ئیدی ناتوانی پرسیار لەخۆت نەکەی کە چ هێزێک وای لە چاوانی ئەو کچە کردووە ئاوا خەمبار و تیژ و بریسکەدار بێت؟ چ هێزێک وا لەو خوێنە دەکات ئەو کوڵمە زەردهەڵگەڕاوانەی ئەو، پەمبە هەڵگەڕێت؟ یا چ هێزێک وادەکات وەک ئەوەی لە ئاوی ئەوین هەڵکێشرابیت؟ یا چ هێزێک وادەکات لە خۆشیدا سینەت قورس بکات؟ یا ئەو شتەی لەناکاو پێی دەڵێن ژیان، جوانی، هێز، وا لە سیمای ئەو کچە بەستەزمانە بکات لەگەڵ چەند زەردەخەنەیەکدا بدرەوشێتەوە و ببریسکێتەوە، لە نێو پێکەنینێکدا بگەشێتەوە؟! ئاوڕ دەدەیتەوە و چاو بەدوای کەسێکدا دەگێڕی و هەڵی دەسەنگێنی بزانی کێیە... بەڵام ئەو ساتە تێ دەپەڕێت... ڕۆژی دواتر چاوت بەهەمان

سیمای خەمبار و داگیرکراو دەکەوێتەوە، هەمان سیمای زەردهەلگەڕاو، هەمان جووڵەی شەرمنانە و نەرم و نیان، هەتا چاوت بە نیشانەی پەشیمان بوونەوە و شوێنەواری خەفەت و پەشیمانییە تێکشکاوە خێراکەشی دەکەوێت، بەڵام تۆ خەفەت بۆ ئەو جوانییە ساتەوەختییە دەخۆی کە زۆر بەزوویی هەڵوەریوە و تاهەتایە ناگەڕێتەوە، بەخیانەتێکی برووسکەئاسا، زۆر خۆپەرستانە و خەفەتبارانە بە سەرتدا تێپەڕیوە، چونکە هەتا بگرە کاتیشت نەبووە تا خۆشت بوێ.

لەگەڵ ئەوەی ڕۆژەکەم بەو شێوەیە بوو کەچی شەوەکەم باشتر بوو...هەر بەو جۆرەی کە ڕووی دا.

درەنگی شەو بوو دەگەڕامەوە بۆ شارۆچکە، کات گەیشتبووە کاتژمێر دە کە لە ڕێگای چوونە ماڵەوە بووم، ڕێگاکەم بە درێژایی پردێکی سەر رووبارەکەوە بوو، لەو کاتە درەنگانەی شەودا هەرگیز چاوت بە کەسێکیش ناکەوێت، من خۆم لە لاپەڕگەی شاردا دەژیم. کە لەڕێگادا دەرۆیشتم گۆرانیم لەبەر خۆم دەگوت، بۆ ئەو کاتانەش کە دڵخۆشم هەمیشە منگە منگ لەبەر خۆم دەکەم، وەک ئەو کەسە دڵخۆشەی کە هیچ هاوڕێیەک و هیچ ئاشنایەکی نییە تا خۆشییەکانی خۆی لەگەڵیدا بەش بکات. لەپڕ ڕووداوێکی چاوەڕواننەکراو ڕووی دا. ئافرەتێک باسکەکانی خۆی بەسەر لێوی بەربەستە ستوونییەکانی پردی سەر ڕووبارەکەوە نوشتاندبۆوە، بە هەستێکی قووڵەوە تەماشای ئاوە لێڵ و شێلووەکەی ناو ڕووبارەکەی دەکرد، شەپقەیەکی زەردی سەرنجڕاکێش و شاڵێکی ڕەشی لێوەشاوەی لەبەر دابوو. لەبەر خۆم گوتم:





– ئەوە کچە، دڵنیام کچە! کەمێک ڕەنگ ئەسمەریشە.

وا دیاربوو ئەو ئاگای لە دەنگی هەنگاوەکانی پێم نەبوو، هەتا بگرە خۆشی وەرنەسووڕاند کاتێ کە بە دڵەڕاوکێ و دڵەخورپەوە بەلایدا تێپەڕیم، بیرم کردەوە "سەیرە، دەبێ بە قووڵی بیر لە شتێک بکاتەوە!" لە ناکاو لە شوێنی خۆمدا وەکو بەرد وەستام کاتێک کە گوێم لە دەنگی هەنسکدانێکی هێمن بوو، بەڵێ بە هەڵەدا نەچووبووم، کچەکە دەگریا. خولەکێک دواتر گوێم لە دەنگی هەنسک لە دوای هەنسک دەبوو، خوایە! دڵم نقوم بوو. ئای چەندە شەرمنم کە لەگەڵ ئافرەتاندام، ئێستاش ئەوا هەمان ئەو ساتە بوو! ئاوڕێکم لێ دایەوە، چەند هەنگاوێکم بەرەو لای هەڵگرت، ویستم پێی بڵێم (خاتوون) بەڵام بیرم کردەوە ئەم وشەیە سەدان جار لە ڕۆمانەکانی کۆمەڵگەی ڕوسیدا بەکار هاتووە، بۆیە ئەمە وای لێ کردم بووەستم، بەڵام کاتێ بە دوای وشەیەکی تردا دەگەڕام، کچەکە هاتەوە سەر خۆی و تەمەشایەکی دەوروبەری خۆی کرد، سەری خۆی دانەواند و بەلامدا تێپەڕی و بە درێژایی شۆستەکەدا شۆڕبۆوە، منیش یەکسەر بەدوایدا ڕۆیشتم، ئەو پردەکەی بەجێهێشت و لە شەقامەکەدا پەڕییەوە، لەوبەری لەسەر شۆستەکدا دەڕۆیی، دڵم کەوتبووە تەپە تەپ وەک باڵندەیێکی گیراو لە قەفەزی سینگمدا ئارامی نەدەگرت و لە پەلەقاژەدا بوو، ئیدی هەر ئەوەندەی نەبرد بەخت لای لێ کردمەوە.

لە ناکاو لە سەر شۆستەکە لە لای کچەکە، پیاوێ بەجلی شەوانەوە کە لە تەمەنی کامڵیدا بوو بەدیار کەوت، بەڵام بەو مانایە نا کە ڕۆیشتنی کاماڵانەی لێ بەدی بکرابا، بەلادا دەهات و خۆی دەدا بەدیوارەکەدا، کچەکە وەک ئەوەی تیر لە کەوان دەرچووبێ و لەگەڵ

پەلەکردنێکی شەرمنانە کە لە هەموو کچێکدا دەبینرێ کاتێک نایەوێ هیچ کەس هاودەمی ماڵەوەی بێ، تێ پەڕی. گومانی تێدا نەبوو گەر بەختی من نەبوایە پیاوە مەستەکە دوای نەدەکەوت. لەناکاو، بەبێ گوتنی هیچ وشەیەک پیاوەکە بەخێراییەکی زۆر بە دوای گرتنی خاتوونە نەناسراوەکەم ڕای کرد، کچەکە وەکو با دەڕۆیی بەڵام پیاوەکە خێراتر بوو پێشی لێ گرتەوە، کچەکە قیژەیەکی لێ هەڵساو... منیش سوپاسی ئەو گۆچانەی دەستم دەکەم لەو کاتەدا واڕێکەوت لە دەستی ڕاستمدا بوو، وەک برووسکە لە شەقامەکە پەڕیمەوە و کابرام فڕێ دا لایەک کە دای لە بۆڵەبۆڵ و کەوتە دواوە، کاتێ کەمێک لێی دوورکەوتینەوە هەندێ وشەی ناشرینی لەدەم دەرهات کە بەحاڵ دەمانبیست.

بەکچەکەم گوت:

– دەستت بێنە، چیتر ناتوانێ بێزارمان بکات.

ئەو یەکسەر دەستی گرتم کە هێشتا لەخۆشییان و لە ترسان دەلەرزی، ترس لەو کابرایەی کە بەدوایدا ڕایکردبوو، خۆشیش لەوەی لێی ڕزگار ببوو. ئای، کابرای مشەخۆری سەرخۆش! چەندەم دووعا بۆ کردووی بۆ ڕەخساندنی ئەم دەرفەتە بۆم لەم ساتەدا! نیگایەکم لێ کرد، زۆر سەرنجڕاکێش بوو و ڕەنگ ئەسمەریش بوو، پێشتر باشم هەڵسەنگاندبوو. لە برژانگە ڕەشەکەی هێشتا دڵۆپە فرمێسک دەتکا، نازانم لەبەر خەفەتی ئەو ساتە بوو کە لەسەر بەربەستە ستوونییەکانی سەر ڕووبارەکەوە دەگریا یانیش لەبەر ترسی ئەو پیاوە بوو؟! بەڵام دیار بوو زەردەخەنە قنجی لە بن لێوانی هەڵدابوو. ئەویش نیگایەکی خێرای لێ کردم، کوڵمەکانی پەمبە هەڵگەڕان و سەری دانەواند. گوتم:





– دەبینی چی ڕووی دا، بۆچی لەبەرم ڕات کرد؟ ئەگەر لەگەڵتدابام هیچ شتێک ڕووی نەدەدا.

– بەڵام تۆم نەدەناسی، بیرم کردەوە کە تۆش...

– بۆچی؟ ئەی ئێستا من دەناسی؟

– کەمێک... بۆچی دەلەرزی؟

– ئا، بەڵێ لە یەکەم هەڵسەنگاندنت ڕاست بووی.

گەشامەوە بەوەی ئەو کچە زیرەکی هەبوو، چونکە هەرگیز زیرەکی و جوانی بەیەکەوە لە کچێکدا کۆ نابنەوە.

بەڵێ، لە یەکەم چاو پیاخشاندنتدا هەڵتسەنگاند کە مامەڵەت لەگەڵ چ پیاوێکە، ڕوونتر بڵێم من شەرمنم لەگەڵ ئافرەتدا، دەشڵەژێم، نکۆڵیشی لێ ناکەم، هەروەک ئەو چەند خولەکەی پێشووتر تۆ چۆن بووی لەگەڵ ئەو پیاوەی کە زەنگی مەترسی بۆ لێدای، منیش ئێستا لەو مەترسییەدام، ئەوە وەک خەونێک وایە، هەر گیز وا هەست ناکەم لە خەونیشدا بێت قسەم لەگەڵ ئافرەتێکدا کردبێت.

- چی، بەڕاستیتە ؟

- بەڵێ ئەگەر دەستەکانم دەلەرزن ئەوا لەبەر ئەوەیە هەرگیز لە لایەن دەستی هیچ کچێکی جوانی وەک تۆ نەگیراون، من تەواو غەریبەم بەلای ئافرەتەوە، بۆیە هەرگیز پێیانەوە ڕانەهاتووم. دەبینی من تەنیام... بگرە نازانم چۆن قسەشیان لەگەڵدا بکەم، نازانم ئێستا ئاخۆ شتێکی گەمژانەم گوتووە یا نا، ڕاستەوخۆ پێم بڵێ بێ پێچ و پەنا، پێشتر دڵنیات دەکەمەوە من لەو جۆرە کەسانە نیم کە زوو هەست بە برینداری بکەم.

– نا هیچت نەگوتووە بەڵکو بەپێچەوانەوە، ئەگەر سووری لەسەر ئەوەی بێ پێچ و پەنا ڕاستییەکەت پێ بڵێم، ئەوا پێت دەڵێم ئافرەتان حەز بەو جۆرە شەرمە دەکەن، ئەگەر دەتەوێ زیاتریش بزانی، منیش حەزی پێ دەکەم، چیتر لێت ڕاناکەم تا دەگەمە ماڵەوە.

بە هەناسە برکێکەوە، گوتم:

– تۆ وام لێدەکەی شەرمەکەی خۆم لەدەست بدەم و خوا حافیزی لە هەموو چانسەکانم بکەم...

– چانس! چانس لە چیدا؟ ئەم وشەیە جوان نییە.

– ببوورە، داوای لێبووردن دەکەم، ئەو وشەیە لە زارم دەرپەڕی، بەڵام تۆ چۆن لەساتێکی وادا چاوەڕوانی ئەوە لە کەسێک دەکەی کە هیچ ئارەزوویەکی نەبێت....؟

– ئارەزووی چی؟ حەزی لێ بکرێ، ئێههه ؟

– ئا بەڵێ. بەڵام لەبەر خاتری خوا، میهرەبان بە لەگەڵم، بێنە پێش چاوی خۆت من چیم؟! کەسێکی بیست و شەش ساڵە، هیچ کەسم نەدیوە، چۆن چاوەڕوانی ئەوە دەکەی بە زمانێکی باش و بە وریاییەوە قسە بکەم بێ ئەوەی کەس بێزار بکەم و یەکسەر بچمە سەر بابەتی مەبەست؟ ئەگەر ڕێگەم بدەی هەموو شتێکی خۆمت بێ پێچ و پەنا و بە کراوەیی پێ بڵێم، ئەوا ئەو کات زۆر باشتر دەبێت بۆت، زیاتر لێم تێدەگەی ... من زارم چۆن بێدەنگ بێ کاتێک کە دڵم دەیەوێ قسە بکات؟! باشە، گوێی پێ مەدە ... باوەڕم پێ بکە، یەک ئافرەت چییە هەرگیز نەبۆتە ئاشنام! من هیچیش ناکەم تەنها ئەوە نەبێت هەموو ڕۆژێک خەون دەبینم و خەیاڵ دەکەم تا لە کۆتاییدا لەوانەیە چاوم بە





یەکێک بکەوێت. وای ئەگەر دەزانی چەند جار کەوتوومەتە داوی خۆشەویستی لەو ڕێگەیەوە.

– چۆن؟ لەگەڵ کێ؟

– بۆچی؟ لەگەڵ هیچ کەس، تەنها لەگەڵ کەسێکی خەیاڵی، لەگەڵ ئەو کەسەی کە لە کاتی نوستنمدا خەونی پێوە دەبینم. لە خەونەکانمدا خۆشەویستی ئاسایی دەکەم. ئا تۆ من ناناسی! بێگومان ئەوە ڕاستە کە چاوم بە دوو سێ ئافرەت کەوتووە و لەگەڵیان دواوم، بەڵام چ جۆرە ئافرەتێک بوون!؟ هەموویان خاوەن ماڵ و سامان بوون و خانووی بە کرێیان هەبوو بۆ خەڵک... ئەگەر پێت بڵێم کە تا ئێستا بیرم لە قسەکردن کردۆتەوە لەگەڵیان، تەنها قسەکردن لەگەڵ چەند ئافرەتێکی ئەرستوکراتی لە شەقامەکاندا، لەوانەیە پێم پێبکەنی! بەڵێ، کاتێ دەبینم بە تەنیان، بەزەحمەت پێیان دەڵێم (بێگومان بە شەرم و بە ڕێز و بە سۆزەوە) پێیان دەڵێم من لە تەنیاییدا مردووم، لێیان دەپاڕێمەوە کە فەرامۆشم نەکەن، پێیان دەڵێم من چانسی دروستکردنی ئاشنایەتیم نییە لەگەڵ هیچ ئافرەتێکدا، کاریگەرییان لە سەر دادەنێم و خۆم غەریبانە دێنمە بەرچاو تا پێیان بڵێم ئەوە کارێکی چاکە و خێرە ئەگەر تکای کەسێکی وەک من ڕەت نەکەنەوە، کە لە ڕاستیدا هەموو ئەو شتەی کە من دەمەوێ ئەوەیە کە دوو سێ وشەی خۆشکانەی سۆزدارانەم بۆ بکەن، حەز دەکەم لە یەکەم نیگایاندا ڕەتم نەکەنەوە، پێویستە لێم دڵنیا بن کە چی دەڵێم، یا پێم پێبکەنن ئەگەر حەز دەکەن، هانم بدەن، دوو قسەم بۆ بکەن، تەنها دوو قسە، هەتا بگرە دواتر یەکتریش نەبینینەوە! بەڵێ ئەم قسانەم وات لێدەکەن کە پێبکەنی، هەر ئەوەیە کە پێت دەڵێم.....

– جارس مەبە، من تەنها بەوە پێدەکەنم کە بوویت بە دوژمنی خۆت، ئەگەر هەوڵت دابووایە ئەوا لەوانەیە سەرکەوتوو ببایت، هەرچەندە لە شەقامیشدا بووە، چونکە سادەتر هەمیشە باشترە... هیچ ئافرەتێکی دڵنەرم و بە بەزەیی وا ناکات بۆ چەند ساتێک خۆی جارس بکات و خۆی بێت بە دوو قسە تۆ بەرێ بکات کە بە شەرمەوە داوای دەکەی، مەگەر ئەو ئافرەتە زۆر گەمژە بێت... بەڵام من چی دەڵێم؟ بێگومان، ئەو وا تێدەگات کە تۆ پیاوێکی شێتیت، من لە ڕوانگەی خۆمەوە بڕیار دەدەم و زۆر شتیش دەربارەی ژیانی خەڵکانی تر دەزانم.

– سوپاس، تۆ نازانی ئێستا چیت بۆ من کردووە!

– خۆشحاڵم! سوپاس. بەڵام پێم بڵێ چۆن زانیت من لەو جۆرە ئافرەتانە بووم کە تۆ وا بیر دەکەیتەوە بۆ هاوڕێیەتی و بۆ چاودێریکردن بە نرخ بن، نەک ئافرەتێکی خاوەن ماڵ و سامان کە تۆ خۆت دەڵێی؟ چ شتێک وای لێ کردووی نزیک بیتەوە و بێی بۆ لام؟

– چ شتێ وای لێ کردم ؟ بەڵام تۆ بە تەنیا بوویت، ئەو کابرایەش زۆر بێ ڕێز بوو، خۆت دەزانی شەویشە. خۆت دەبێ دان بەوەدا بنێی کە ئەوە ئەرکە ...

– نا، نا. من مەبەستم پێشترە، لە لایەکەی تری شەقامەکە، دەزانی مەبەستم لە نزیکبوونەوەکە چییە؟

– لە لایەکەی تری شەقامەکە؟ لە ڕاستیدا نازانم چۆن وەڵامت بدەمەوە، دەترسم.....دەزانی ئیمڕۆ زۆر دڵخۆش بوویمە؟ بەدرێژایی ڕێگا کە دەڕۆیشتم گۆرانیم دەگوت، چووبوومە شار، هەرگیز ساتی ئاوها خۆشم نەبووە. تۆ.... ئەوە بیرکردنەوەی خۆمە، داوای لێبووردن





دەکەم کە باسی دەکەم، تۆ دەگریای، منیش... کە بیستم دەگری نەمتوانی خۆم بگرم، ئەم گریانەی تۆ وای لێ کردم دڵم بە ئێش بکەوێ و ئازار بخوا، ئای خوایە! لەوانەیە نیگەرانی تۆم هاتبێتێ لەو کاتە دا! بێگومان هیچ سەختییەک نییە لە هەستکردنی سۆزێکی برایانە بۆ تۆ........داوای لێبووردن دەکەم کە گوتم سۆز ...... بە کورتی خۆ هەستت بریندار نەبوو بەرامبەر بەم خۆ تێهەڵقورتانەی من؟

– بووەستە، تکایە ئەوەندە بەسە، چیدی لە سەری مەدوێ.

ئەو ئەمەندەی گوت و چاوی داخستە خوارەوە، لە کاتێکدا دەستی زیاتر داگرتە سەر دەستم. دواتر گوتی:

– ئەوە هەڵەی من بوو کە وام لێ کردی دەربارەی ئەو شتە قسە بکەی، بەڵام من خۆشحاڵم لە تۆدا بە هەڵەدا نەچووبووم، لێرەدا وا گەیشتمە ماڵەوە، پێویستە لەم کۆڵانەدا بڕۆمەوە، ماڵەکەمان چەند هەنگاوێک لێرەوە دوورە ... ماڵئاوا ... سوپاس !

– مەبەست ئەوەیە ... کە جارێکی تر یەکتر نابینینەوە؟

ئەو بەپێکەنینەوە گوتی:

– دەبینی، لە سەرەتادا تۆ تەنها دوو قسەت دەویست، بەڵام ئێستا... هەرچەندە من هیچ ناڵێم..... لەوانەیە چاومان بەیەک بکەوێتەوە.....

– بەیانی دێمەوە ئێرە، داوای لێبووردن دەکەم کە لە ئێستاوە داوات لێ دەکەم ...

– بەڵێ، زۆر بێ ئارامی ... پێداگریشی.

قسەکانم پێ بڕی و گوتم:

– گوێ بگرە، گوێ بگرە! داوای لێبووردن دەکەم ئەگەر شتێکی ترت

پێ دەڵێم ... چیت پێ بڵێم؟! بەیانی ناتوانم بێم بۆ ئێرە، من کەسێکی خەیاڵپڵاوم هەمیشە خەون دەبینم و خەیاڵ دەکەم، زۆر کەم ژیانی ڕاستەقینە دەژیم، کە تەماشای ئەو ساتانەی وەکو ئێستام دەکەم، کە زۆر دەگمەنیشە، لە خەیاڵ و خەونەکانیشدا ناتوانم بەسەریان بچمەوە، ئەم هەفتەیەی بێتەوە، بگرە بە درێژایی ئەمساڵ هەر خەون بە تۆوە دەبینم، دێمەوە بە دڵنیاییەوە سبەینێ دێمەوە ئێرە، هەر بۆ ئەم شوێنە، دڵخۆش دەبم بە وەیادهێنانەوەی ئەمڕۆ، ئەم شوێنە بەڕێزە لەلای من، ئیدی ئێستا من دوو سێ شوێنم هەیە لە "پترسبۆرگ"دا . جارێکیان فرمێسکم ڕشت لەسەر یادگارییەکان... وەکو تۆ... کێ دەزانێ؟! لەوانەیە تۆش دە خولەک پێش ئێستا بۆ چەند بیرەوەرییەکت دەگریای و فرمێسکت هەڵدەڕشت..... بەڵام، بمبەخشە دیسان خۆم لەیاد کرد، لەوانەیە جارێک لەجاران لێرەدا هەستت بە خۆشی یا بە بەختەوەری کردبێ، لێرەدا...

– زۆر باشە، لەوانەیە منیش بەیانی بێمەوە ئێرە، کاتژمێر دە، وا دەبینم کە ناتوانم ڕێگەت لێ بگرم ... ڕاستییەکەی ئەوەیە من دەبێت لێرەبم، وا تێنەگەی من ژوان لەگەڵ تۆدا دەبەستم، من پێشتر پێت دەڵێم کە دێمەوە ئێرە لەسەر حیسابی خۆم دێم. بەڵام ... باشە بەڕوونی هەموو شتێکت پێدەڵێم، بەلامەوە گرنگ نییە ئەگەر بێی، لەوانەیە شتێک ڕوبدات هەروەک چۆن ئەمڕۆ شتێک ڕووی دا، بەڵام هەر گوێشی پێ مەدە..... بە کورتی، حەزدەکەم بتبینم..... تا دوو قسەت بۆ بکەم، تەنها ئەوە گرنگە تۆ شتی خراپتر لە من چاوەڕوان نەکەی! وا بیر مەکەوە کە من بەو سانایییە ژوان دابنێم ... من ئەو شتە ناکەم مەگەر...... لێگەڕێ با ئەوە نهێنی خۆم بێت! تەنها گرێبەست





بێ لە پێشوەختدا ...

– گرێبەست! قسە بکە، پێم بلێ، پێشوەخت پێم بڵێ، بە هەموو شتێک ڕازی دەبم، من ئامادەم بۆ هەموو شتێک، خۆم وەڵامی خۆم دەدەمەوە و گوێڕایەڵ دەبم، بەڕێز دەبم ... خۆ تۆ من دەناسی!

کچەکە بەپێکەنینەوە گوتی:

– هەر لەبەرئەوەی تۆ باش دەناسم، بۆیە داوات لێ دەکەم بەیانی بێیتەوە، بەڵام ئەگەر دەکرێ بەیەک مەرج بێیتەوە، لە سەرەتا (باش بە، ئەوە بکە کە من داوای دەکەم، دەبینی بێ پێچ و پەنا قسە دەکەم) نابێ لەگەڵ مندا بکەویە داوی خۆشەویستییەوە ... ئەمە ئەستەمە، دڵنیات دەکەمەوە، من ئامادەم بۆ هاوڕێیی، بەڵام نابێ بکەویە داوی خۆشەویستیمەوە، تکات لێ دەکەم!

دەستەکانیم توند کوشی و گوتم:

– سوێند بێ.

– وووسس، سوێند مەخۆ، دەزانم تۆ بەر لەئێستا وەکو بارووت گڕت دەگرت، بە گوتنی ئەم شتانە بە نەزانم تێمەگە، ئەگەر زانیت، منش زانیم، من کەسێکم نییە تا قسەیەکی بۆ بکەم، یا بتوانم داوای ئامۆژگاری لێ بکەم، وا تۆ دەناسم وەک ئەوەی بیست ساڵ بێ بەیەکەوە هاوڕێ بین، بێگومان کەس لە شەقامدا بەدوای ئامۆژگاریدا ناگەڕێ، بەڵام تۆ جیاوازی، ناتوانی هەڵمخەڵەتێنی، دەتوانی ؟

– دەزانی تەنها شت کە بەلامەوە ناخۆش بێ ئەوەیە، چۆن ئەم بیست و چوار کاتژمێرەی داهاتوو تێدەپەڕێ و لێی ڕزگار دەبم!

– بەهێمنی بنوو، شەوباش! لەبیرت بێ من لە ئێستاوە متمانەم پێ کردووی، بەڵام زۆر سەیر هاوارت کرد کە "بە دڵنیاییەوە هەموو کەس

ناتوانێ بەرپرس بێ لە هەموو هەستێکی، هەتا بگرە بۆ سۆزێکی برایانەش " دەزانی ئەوە زۆر بەجوانی گوترا، یەکسەر وای کرد بیرۆکەیەک بە مێشکمدا بێت، نازانم پێویست دەکا بیدرکێنم یان نا؟

– بۆ خاتری خوا! بیلێ، بەڵام لەبارەی چی؟ چییە؟

– تا سبەی چاوەڕوان بکە، لە هەمان کاتدا لێ بگەڕێ با ئەوە ببیتە نهێنی، زۆر باشتریشە بۆ تۆ کە بەنهێنی بمێنێتەوە، کەمێک تام و چێژ دەدات بەو ڕۆمانسییەی کە هەمانە، لەوانەیە سبەی پێت بڵێم، لەوانەشە پێت نەڵێم، پێشتر هەندێ قسەت لەگەڵدا دەکەم، ئێمە دەبێ پێشوەخت هەندێ قسە لەگەڵ یەکتردا بکەین و یەکتری باشتر بناسین.

– باشە، سبەینێ، هەموو شتێکت لەبارەی خۆمەوە پێدەڵێم! بەڵام ئەوەی کە ڕووی داوە دەڵێی پەرجووە کەوتۆتە پێشم! نازانم چۆن باوەڕ بکەم، خوایە من لە کوێم؟! وەرە پێم بڵێ خۆشحاڵ نەبوویت کە لە من تووڕە نەبوویت یا وەک هەر ئافرەتێکی تر لە ساتەکانی سەرەتادا فەرامۆشت نەکردووم؟ بەدوو خولەک منت بەختەوەر کرد تا هەتایە، بەڵێ بەختەوەر، کێ دەزانێ؟ لەوانەیە منت ئاشت کردبێتەوە لەگەڵ خۆمدا، گومانەکانمت چارەسەر کردبێ! لەوانەیە ئەو ساتەی کە بە سەرمدا تێپەڕی..... بەڵام سبەی هەموو شتێکت لەو بارەیەوە پێدەڵێم، سبەی هەموو شتێک دەزانی ...

– زۆر باشە، حەز دەکەم تۆ سەرەتا دەست پێبکەی.

– باشە ڕازیم.

– ماڵئاوا تا سبەی.

– تا سبەینێ ماڵئاوا.





لێرەدا ئێمە لێک جودا بووینەوە، من بەدرێژایی ئەو شەوە پیاسەم دەکرد، نەمتوانی بڕیاری چوونە ماڵەوە بدەم، زۆر دڵخۆش بووم ... سبەینێ ! چاوەڕوانی سبەینێم دەکرد.

## شەوی دووەم

ئەو دەستەكانی گوشیم و گوتی:

– باشە، جا ئەمڕۆ ڕزگارت بوو!

– دوو كاتژمێر بەر لە ئێستا من لێرە ئامادە بوومە، تۆ نازانی تەواوی ئەمڕۆ لە چ بارێكدا بوومە!

– دەزانم، دەزانم، بەڵام با بێینە سەر باسەكەمان، دەزانی بۆ هاتووم؟ نەهاتووم تا قسە لەسەر شتی بێ مانا بكەین وەك دوێنێ شەو، چیت پێ بڵێم! پێویستە لە داهاتوودا زۆر بە هەستیاری ڕەفتار بكەین، شەوی ڕابردوو زۆر بیرم لێ كردەوە....





– لە چ ڕوویەكەوە ئێمە پێویستە زۆر هەستیار بین؟ لە چ ڕوویەكەوە؟ من لە لایەن خۆمەوە ئامادەم، بەڵام لە ڕاستیدا شتێكی هەستیارتر لەوەی كە ئێستا ڕووی داوە، پێشتر لە ژیانی مندا ڕووی نەداوە.

– بە ڕاستی؟ یەكەم جار داوات لێ دەكەم ئەوەندە دەستم نەگوشی، دووەم شتیش ئەوەیە كە پێت بڵێم، ئەمڕۆ زۆر بیرم لە تۆ كردەوە و هەستم بە گومان كرد لە تۆدا.

– ئەی دواتر بە چی گەیشت؟

– بە چی گەیشت؟ ئەنجامەكەی ئەوە بوو كە پێویستە لە سەرەتاوە دەست پێ بكەینەوە، چونكە ئەو دەرئەنجامەی ئەمڕۆ پێی گەیشتم ئەوەبوو كە من هیچ تۆ ناناسم، دوێنێ وەك كیژۆڵەیەكی هەرزەكار ڕەفتارم دەكرد، بێگومان ئەوەی جێگەی سەرزەنشتكردنیش بێ ئەو دڵە نەرمەی منە، من پیاهەڵدانم كردووە، پێم وایە هەموو كەسێكیش هەر ئەوە دەكات كاتێ كە لێكدانەوە بۆ ڕەفتاری كەسێكی تر دەكات، لەبەر ئەوە بۆ ڕاستكردنەوەی هەڵەكەم بڕیارم داوە، هەموو شتێك بە وردی و بە ڕوونی لە بارەی تۆوە بزانم، بەڵام لەبەر ئەوەی كەسێكم چنگ ناكەوێت تا لە ڕێیەوە شتێكی لە بارەی تۆوە لێ وەدەست بێنم، بۆیە خۆت پێویستە هەموو شتێكم لە بارەی خۆت پێ بڵێی، باشە... تۆ چ جۆرە پیاوێكی؟! خێرا دەست پێ بكە، ڕابردووی تەواوی خۆتم پێ بڵێ و بۆم بگێڕەوە.

– ڕابردووی خۆم! ڕابردووی خۆم؟! بەڵام كێ پێی گوتی كە من ڕابردووم هەیە؟ من هیچ ڕابردوویەكم نییە...

بە پێكەنینەوە قسەكانی پێ بڕیم و گوتی:

– ئەی باشە تا ئێستا چۆن ژیاوی؟ ئەگەر هیچ ڕابردوویەکت نەبێ؟

– بە دڵنیاییەوە دەڵێم من بێ ڕابردووم! من ژیاوم وەک خەڵک دەڵێم من خۆم بۆ خۆم ژیاوم بە تەنیا، تەنیای تەنیا، دەزانی مانای بە تەنیا ژیان چییە؟

– چۆن بە تەنیا؟ مەبەستت ئەوەیە کەس نابینی؟

– نا نا، من خەڵک دەبینم، بێگومان دەیانبینم، بەڵام من هەر تەنیام.

– ئەی واتە هەرگیز قسە لەگەڵ کەس ناکەی؟

– قسەکردن بە تەواوی، نەخێر لەگەڵ کەسدا نەمکردووە.

– ئەی کەواتە تۆ کێی؟ باسی خۆت بکە! وا هەست دەکەم زۆر پێ دەچێ تۆش وەک من داپیرێکت هەبێت. من داپیرم کوێرە و لێناگەڕێ بۆ هیچ شوێنێک بچم، بۆیە من خەریکە لە یادم چووبێتەوە کە چۆن قسە بکەم، دوو ساڵ بەر لە ئێستا کاتێ هەندێ هەرەپاسیم کرد، ئیتر زانی ئەگەر وا بڕوات ئەوا دەسەڵاتی بەسەرمدا نامێنێت، بۆیە جلەکانمی بە پەتێک بە جلەکانی خۆی بەستاوە، لەو کاتەوە من بە درێژایی ڕۆژ بە تەنیشتی ئەوەوە دادەنیشم، ئەو هەرچەندە کوێریشە بەڵام گۆرەوی دەچنێ، منیش لە تەنیشتییەوە کاری دوورین دەکەم یا بە دەنگی بەرز شتی بۆ دەخوێنمەوە، چەند خوویەکی سەیرە! ئیدی ئەوە بۆ ماوەی دوو ساڵە جلەکانم بە پەتێک بە جلەکانی ئەو بەستراوەتەوە.

– ئەی خوایە، چەند ناخۆشە! بەڵام نەخێر من داپیرەیەکم نییە بەو شێوەیە.

– باشە، ئەی گەر داپیرەیەکت نییە وەک من بۆ لە ماڵەوە دادەنیشی؟





– دەتەوێ بزانی من چ جۆرە پیاوێکم ؟

– بەڵێ.

– بە مانای وشە دەتەوێ بزانی من چ جۆرە پیاوێکم؟

– بەڵێ دەمەوێ بە تەواوەتی بزانم.

– زۆر باشە، من "جۆرێک"م.

– جۆر، جۆر؟ چ جۆرێک؟

وا هاواری کرد و پێکەنی وەک ئەوە وابوو کە بۆ ماوەی ساڵێک دەرفەتی پێکەنینی نەبووبێت. پاشان گوتی:

– قسەکردن لەگەڵ تۆدا زۆر خۆشە، با لەو جێگەیە دانیشین، کەس بێرەدا تێپەڕ نابێت و کەسیش گوێی لێمان نابێت، دەست بە گێڕانەوەی ڕابردووی خۆت بکە، هەرچەندە بۆ من باش نییە بیگێڕیتەوە. من دەزانم تۆ ڕابردووەکت هەیە و دەتەوێ بیشاریتەوە، بەوە دەست پێ بکە "جۆر" چییە؟

– جۆر؟ جۆرەکەی جۆرێکی ڕەسەنە، کەسێکی گەمژەیە.

ئەوەم گوت لە کاتێکدا بە پێکەنینە منداڵانەییەکەی ئەو بەنج ببووم. پاشان گوتم:

– سیفەتێکە، گوێ بگرە! دەزانی "خەیاڵپلاو" مانای چییە؟

– خەیاڵپلاو! لە ڕاستیدا پێویستیم بە بیرکردنەوەیە تا بیزانم، من خۆم خەیاڵ دەکەم، هەندێ جار لە تەک داپیرمەوە دادەنیشم، هەموو جۆرە شتێک دێتە مێشکم، کاتێ یەکێ خەیاڵ دەکات و بیر لە کەسێکی تر دەکاتەوە ئیدی هیچ شتێ لە کەسی بەرامبەری قوتارناکات و بیر لە هەموو شتێکی دەکاتەوە، لە خەیاڵەکانمدا شوو بە

شازادەی چینی دەکەم!... هەندێ جار خەون بینین و خەیاڵکردن شتێکی زۆر چاکە بە تایبەتی ئەو کاتانەی کە شتێک هەیە دەتەوێ لە بەشێک لە خەونەکانتدا بیری لێ بکەیتەوە.

– زۆر باشە! ئەگەر لە خەیاڵەکانتدا شووت بە شازادە و ئیمپڕاتۆری چین کردبێت، ئەوا تەواو لێم تێدەگەی، گوێ بگرە... بەڵام بووەستە، من تا ئێستا ناوت نازانم.

– لە کۆتاییدا هەر ویستت! من پێم وابوو تۆ پەلەت نییە لە زانینی ناوەکەم.

– ئای خوایە، هەرگیز ئەوە نەهاتبووە مێشکم کە لێت بپرسم بەڵام وا هەست دەکەم بزانم باشترە.

– ناوی من "ناستینکا" یە.

–" ناستینکا" و هیچی تر.

– هیچی تر! بۆچی ئەوەندە بەس نییە بۆت، چەند کەسێکی چاوناتێری!

– بەس نییە؟ بە پێچەوانەوە ئەوەندە بەسە، بەڵکو زۆریشە، ناستینکا تۆ کچێکی میهرەبانی، ئەگەر بۆ من ناستینکا بی لە سەرەتاوە.

– تەواو، ئینجا ؟

– باشە، گوێ بگرە "ناستینکا" بۆ ئەم ڕابردووە بێ مانایە، هەرچەندە لەوانەیە تۆ شارەزای هەموو سووچ و قوژبنەکانی " پترسبۆرگ " نەبیت، هەرچەندە وا پێدەچی یەک خۆر تیشکی پەخش بکات بە سەر خەڵکی پترسبۆرگدا، بەڵام هەندێک لەو خەڵکانە لە





تیشکەکانی ئەو خۆرە ڕانامێنن، بەڵام هەندێکی تریان بە پێچەوانەوەن، بۆ تیشکەکانی ئەو خۆرە و بۆ هەموو شتێکی تریش بیرۆکەی جیاوازیان هەیە. لەو هەموو سووچ و قوژبنانەدا، "ناستینکا"ی بەڕێز، ژیانی تەواو جیاواز بەسەر دەبرێ، جیاواز لەو ژیانەی کە لە دەوروبەرمان و لە بەر چاومان دەیبینین، بەڵام لەوانەیە ئەو جۆرە ژیانانە لە شوێن و کەلێنی نادیاردا بوونیان هەبێ، نەک لە نێو ئێمەدا لە بارە ئاسایی و نائاسایییەکانی ئێمەدا. بەڵێ، ژیان تێکەڵەیەکە لە چەند شتێکی سەمەرەی زۆر نموونەیی لەگەڵ شتێکی (حەیف ناستینکا!) ئایەخ و بێزارکەر، نەک بڵێم قێزەوەن.

– ئای خوایە !چ پێشەکییەک بوو، ئەوە چی دەبیستم؟!

– گوێ بگرە، ناستینکا (وادیارە هەرگیز لە دەربڕینی ناوت ماندوو نابم) با ئەوەت پێ بڵێم کە لەو سووچ و قوژبنانەدا خەڵکی خەیاڵپڵاوی سەیر دەبینی. "خەیاڵپڵاو" ئەگەر پێناسەیەکی تەواوت دەوێ ئەوەیە مرۆڤ نییە، زیندەوەرێکە نە مرۆڤ نە ئاژەڵ، لەو نێوانەدایە، لە زۆربەی جاردا لە قوژبنە دوور دەستەکانی مرۆڤدان، وەک ئەوەی بیانەوێ خۆیان لە ڕووناکی ڕۆژ بشارنەوە، سەرەتا بۆ سووچەکان دەخشن تا دواتر ئەو سووچانە دەبن بە قاوغ بۆیان وەک "هێلکە شەیتانۆکە" یا بە هەرحاڵ زۆر لەو زیندەوەرە دیارە دەچن کە گیانلەبەرە و لە هەمان کاتدا خانووشە، کە پێی دەگوترێ "کیسەڵ"، باشە تۆ وا هەست دەکەی ئەو بۆ ئەوەندە شەیدای چوار دیوارەکە بێت، ئەو دیوارەی کە بە یەک شێوەی جێگیر بۆیە کراوە، بە بۆیەکی سەوزی خەمناکی تاریک لەگەڵ بۆنێکی ناخۆش وەک بۆنی تووتن؟ بۆچی ئەو پیاوە بەڕێزە کاتێ دۆست و ناسیاوێکی سەردانی دەکات

(کە لە کۆتاییشدا واز لە هەمووان دێنێت) یا چاوی پێ دەکەوێت، تووشی شەرمەزاری دەبێت و سەراپای جەستەی دەشڵەژێ و دەپەشۆکێ، وەک ئەوەی تازە لە ناو چوار دیوارەکەیدا کەسێکی کوشتبێت، یا وەک ئەو کەسەی چەکی بانکی تەزویر کردبێت خۆی حەشار دابێت، یا وەک ئەو کەسەی شیعر دەنووسێت و دەینێرێت بۆ ڕۆژنامەیەک تا بە ناوێکی خوازراو بۆی بڵاو بکەنەوە و بڵێین کەوا شاعیرەکەی مردووە و بڵاوکردنەوەی لە لایەن هاوڕێیەکانی ئەرکێکی پیرۆزە؟ لەبەر چی ناستینکا، لەبەر چی؟ لەبەر چی گفتوگۆ کردنی نێوان دوو هاوڕێ ئاسان نییە؟ بۆ پێکەنینی تێدا نییە؟ بۆچی وشەیەکی زیندوو خۆش لە دەمی ئەو هاوڕێیە تازەیە نایەتە دەرەوە، کە لەوانەیە لە کاتەکانی تردا زۆر شەیدای پێکەنین و وشەی خۆش و گفتوگۆ بێت، هەتا بگرە شەیدای قسەکردن لەسەر ڕەگەزی بەرامبەریشی بێت، یا شەیدای شتە دڵخۆشکەرەکانی تر بێت؟ بۆچی ئەو هاوڕێیە یا بڵێین ئەو هاوڕێیە تازەیەی کە یەکەم سەردانییەتی زۆر بە دەگمەن سەردانی دووەمی دەکاتەوە و جارێکی تر ناگەڕێتەوە؟ بۆچی ئەو هاوڕێیە کاتێ سەیری سیمای خەمباری خانەخوێکەی دەکات، سەرەڕای زرنگییەکەی (کە ئەگەر هەیبێ) ئەوەندە شڵەژاو و دەم بەستراو دەبێ، پاش هەوڵدانێکی بێ وچان بەڵام بێ بەرهەم بۆ ئاساییکردنەوەی شتەکان و خۆشکردنی گفتوگۆکە، کەچی کە نۆبەی ئەو دێت بۆ قسەکردن بە تەواوی بێ دەربەست دەبێ، نازانێ چی بکات تا زانیاری لە سەر ئەم کۆمەڵگا نوێیە بە ئەدەبەی دەرببڕێت، یا قسە لەسەر ڕەگەزی بەرامبەری بکات، یا بە هۆی هەر هەوڵێکی تری لەو جۆرەوە دڵی کابرای بەستەزمانی خانەخۆکەی خۆش بکات، کە دەڵێی





ماسییە لە ئاو دەرهاتووە بە هەڵە ڕێی بە لای ئەودا کەوتووە؟ بۆچی ئەو پیاوە بەڕێزە یەکسەر لەو ساتەدا هەندێ کاری پێویستی بە یاد دێتەوە کە پێشتر هەرگیز بوونیان نەبووە؟ لە پڕ دەست بە کڵاوەکەی دەگرێ و بە پەلە تێ دەتریقێنێ و دەڕوات، تا ڕابکات لە دەست خانەخۆکەی وە بە لایەنی کەم دەیەوێ پەشیمانی خۆشی نیشان بدات بۆ ئەو هەڵوێستە لە دەستچووەی؟ بۆچی ئەو هاوڕێیە کە لە دەرگا دەچێتە دەرەوە زەردەخەنە دەکات و سوێند دەخوات کە هەرگیز بۆ دیتنی ئەم زیندەوەرە سەیرە کە کابرای خانەخۆیە نەگەڕێتەوە هەرچەندە ئەم زیندەوەرە سەیرەش کەسێکی بەرز و باشیش بێ؟ لە هەمان کاتدا ناتوانێ خۆی لەو خەیاڵانە لابدات کە بە بەراورد لە نێوان دەربڕینەکانی دەموچاوی کابرای خانەخۆکە لە کاتی گفتوگۆکردنەکەیاندا و لەگەڵ دەربڕینەکانی دەموچاوی بێچووە پشیلەیەک دەیکات، ئەو بێچووە پشیلە بەستەزمانەی کە بێ بەزەییانە دەستگیر کراوە و لێی دراوە و ترسێنراوە، لە لایەن منداڵانەوە هەموو جۆرە سووکایەتییەکی پێ کراوە، هەتا بێ ئومێدانە لە ژێر تاریکی کورسییەک خۆی دەشارێتەوە، بە هەناسە بڕکێوە تف ڕوودەکات، بە پێکانی دەموچاوە سووکایەتی پێکراوەکەی دەسڕێتەوە، دواتر بە تووڕەییەوە تەماشای ژیان و سروشت دەکات، بگرە بە تووڕەییەوە تەماشای ئەو نانەش دەکات کە لە بەرماوەی خاوەنەکەی دەمێنێتەوە و خزمەتکاری بەسۆزی ماڵەکە لەبەر دەمیدا دایدەنێت.

ناستینکا کە لەو ماوەیەدا بە حەپەساوییەوە گوێی لە من ڕادێرابوو، چاوەکانی و دەمە بچووکەکەی کردەوە و گوتی:

– گوێ بگرە....گوێ بگرە، من نازانم بۆچی ئەو هەموو شتانە ڕووی

داوە و بۆچی ئەو هەموو پرسیارە بێمانایەم لێ دەکەیت؟ هەموو ئەو شتەی کە من دەیزانم ئەوەیە کە دەبوایە یەک بەیەکی ئەو سەرکەشیانە بەسەردا ڕوویدات.

بە گرنگییەوە وەڵامم دایەوە و گوتم:

– گومانی تێدا نییە.

ناستینکا گوتی:

– مادام هیچ گومانی تێدا نییە بەردەوام بە، چونکە من هەر دەبێ بزانم کۆتاییەکەی بە چی دەگات.

– ناستینکا، دەتەوێ بزانی ئەو پاڵەوانە کێیە کە من لە سووچی ژوورەکەم دامناوە؟ ئەوە منم (پاڵەوانی هەموو کارەکان خۆمم...خۆم، بەندەی خاکی) تۆ دەتەوێ بزانی من بۆ بە درێژایی ڕۆژگار بیرکردنەوەی خۆم لە دەست داوە و بەسەردانیکردنێکی لە ناکاو و چاوەڕواننەکراوی هاوڕێیەک بێزار دەبووم؟ تۆ دەتەوێ بزانی من بۆ ئەوەندە ڕادەچڵەکام و دەترسام یا کوڵمەکانم سوور هەڵدەگەڕان لە شەرمان، کاتێ کە دەرگای ژوورەکەم دەکرایەوە، کەسێک دەبوو بە میوانم؟ تۆ دەتەوێ بزانی بۆ ناتوانم خزمەتی میوانەکانم بکەم، یا لە ژێر باری قورسی میوانداریم تێکشکاوم؟

– بەڵێ...بەڵێ، دەمەوێ بزانم لەبەر چی؟ ئەوەم مەبەستە، گوێ بگرە! تۆ زۆر بە کاریگەری وەسفی شتەکان دەکەی، تکات لێ دەکەم گەر بتوانی کەمێک سادەتر وەسفی بکەی، تۆ وا قسە دەکەی وەک ئەوەی کتێبم بۆ بخوێنیتەوە.

بە دەنگێکی ڕەق و سەنگینەوە کە بە حاڵ توانیم خۆم لە پێکەنین





ڕابگرم، وەڵامم دایەوە:

– ناستینکا، ناستینکای ئازیز، دەزانم بە کاریگەرییەوە وەسفی شتەکان دەکەم، بەڵام تکا دەکەم، من نازانم کەسانی دیکە چۆن وەسفی دەکەن، لەم ساتەدا ناستینکای ئازیز، لەم ساتەدا وەکو پێغەمبەر سلێمانم، کاتێ بۆ سەدان ساڵ لەناو حەوت بەرگدا لەناو تابووتەکەیدا پاڵکەوت، لە کۆتاییدا ئەم بەرگانەی کە پێی داپۆشرابوون نەمان. لەم ساتانەدا ناستینکا، پاش ئەو هەموو ماوەیە، ئێستا کە چاومان بە یەکتری کەوتووە (چونکە ماوەیەکی زۆر درێژە من تۆم ناسیوە، ناستینکای من، ماوەیەکی زۆر درێژە بە دوای کەسێدا گەڕاوم، ئەم ماوەیە درێژە نیشانەیەکە بۆخۆی لەوەی کە من بە دوای تۆدا گەڕاوم، ئیدی ئەوە لە چارەنووسمان نووسراوە کە دەبوایە چاومان بە یەکتری بکەوێ) بەڵێ ناستینکای ئازیز، پاش ئەو ماوەیە ئێستا کە چاومان بە یەکتری کەوتووە، لەم ساتەدا هەزاران دەمەوانە لە مێشکمدا کراونەتەوە، یا دەبێ ڕێیان پێ بدەم بڕژێنە نێو ڕووباری وشەکانەوە، یانیش بخنکێم، جا بۆیە لێت دەپاڕێمەوە کە لە قسەکردندا نەمپچڕێنی، ناستینکا، بە گوێڕایەڵی و بێ فیزییەوە گوێم بۆ ڕادێرە، ئەگینا بێدەنگ دەبم.

– نا نا نا، تکات لێ دەکەم بەردەوامبە، هیچ قسە ناکەم.

– بەردەوام دەبم، هاوڕێی ئازیزم ناستینکا، کاتژمێرێک هەیە لە ڕۆژەکانی مندا کە زۆر حەزی پێدەکەم، ئەویش ئەو کاتژمێرەی کە هەموو کارێک و سەرقاڵییەک کۆتایی دێت، هەموو خەڵک بۆ خواردنی نانی ئێوارە، بۆ پاڵدانەوە و ڕاکشان، بۆ پشوودان پەلەیانە و بۆ ماڵەوە ڕادەکەن، بۆ ئێوارە و شەوەکان و بۆ هەموو کاتە بەتاڵەکانیان بیر لە

شتی خۆشتر دەکەنەوە. لەم کاتژمێرەشدا پاڵەوانەکەمان (ناستینکا ئەگەر ڕێگەم بدەی چیرۆکەکەم لە سەر شێوەی کەسی سێیەم بگێڕمەوە، چونکە بۆ کەسێک کە چیرۆکێکی وا لەسەر شێوەی کەسی یەکەمدا بگێڕێتەوە، شەرمەزارییە) جا لەو کاتژمێرەدا پاڵەوانەکەمان، ئەویش کاری تەواو بووە، هەنگاو لە دوای هەنگاوی دەنا بۆ ماڵەوە، بەڵام هەستێکی خۆشی سەیر دەموچاوە سست و گرژبووەکەی کاتی کارکردنی داپۆشیوە، ئەو بێ زەوق نەبوو لە تەماشا کردنی زەردەپەڕ کە هێدی هێدی بە ئاسمانی پترسبۆرگدا پەخش دەبوو، کاتێ کە دەڵێم تەماشای دەکرد درۆ دەکەم، لەبەر ئەوەی تەماشای نەدەکرد بەڵکو هەر وەک جارانی ئاسایی بە بێ دەرکپێکردن دەیبینی، وەک ئەوەی ماندوو بێ یا پێشتر بیری قاڵ بووبێ بە هەندێ بابەتی دڵخۆشکەر، بۆیە زۆر بە زەحمەت چاوی بە شتەکانی دەوروبەری دەگێڕا، ئەوەندەش دڵخۆش بوو چونکە ڕۆژی دواتر نەدەچووە سەر کارە تاقەت پڕووکێنەکەی، وەک منداڵێکی قوتابخانە کاتێ بەرەڵای دەکەن بۆ یاریکردن و هاروهاجیکردن چەندە دڵخۆش دەبێ، ئەویش ئەوەندە دڵخۆش بوو. لێی بڕوانە ناستینکا، یەکسەر دەبینی چۆن ئەو هەستە گاڵتەجاڕ و خۆشەی کاریگەری داناوە لەسەر ترسەکە و ئارەزووە نائاساییەکەی، دەبینی کە ئەو وابیر لە شتێ دەکاتەوە.... نانی ئێوارە، تۆ نایەتە بەرچاوت؟ بیر لە ئێوارەکەی دەکاتەوە؟ تۆ پێت وایە کە بەو جۆرەی دەیبینی بیر لە چی دەکاتەوە؟ ئایا ئێستا ئەو تەماشای چی دەکات؟ ئایا تەماشای ئەو پیاوە بەڕێز و سیما سەنگینە دەکات کە زۆر نامۆیە، بەو خانمەی کە بە سواری عارەبانەیەکی ڕاکێشراو بە چەند ئەسپێکی تاودەر بە تەنیشتیدا تێدەپەڕێت؟ ئێستا





ئەو بەو ژیانەی کە هەیەتی دەوڵەمەندە، ئەو لە پڕێکا دەوڵەمەندی بە دەست هێنا، ئەوەش بە بێ هۆ نییە کاتی زەردەپەڕ لەبەردەم ئەودا تیشکەکانی خۆی پەخش دەکات و لێشاوێک بیرکردنەوە و لێکدانەوەی لە دڵی ئەودا هەڵدەقوڵێنێت، ئێستا ئەو زۆر بە دەگمەن تێبینی ئەو ڕێگایە دەکات کە پێشتر بچووکترین شتی کەسەکانی تر خەفەتباریان دەکرد، ئێستا "خواوەندی ئارەزوو" (ناستینکای ئازیز ئەگەر "ژوکۆڤسکی"ت خوێندبێتەوە) بە دەستە ڕەنگینەکانی و بەهۆی سنارە زێڕینەکەی دەستی بە چنین کردووە بە دەوری ژیانێکی ئەفسووناوی جوان، کێ دەزانێ، لەوانەیە دەستە ڕەنگینەکانی ئەم خواوەندە ئەوی بەرز کردبێتەوە بۆ حەوتەمین تەبەقەی ئاسمان، دوور لەو شۆستە بەردینییانەی کە ئەو پیاسەی بەسەردا دەکرد؟ هەوڵدە بیوەستێنی ناستینکا، پێی بڵێ کە ئێستا لە کوێدا وەستاوە و بە چ شەقامێکدا دەڕوات؟ لەوانەیە ئێستا هیچی بەیاد نێتەوە و نەشزانی بۆ کوێ دەڕوا و لە کوێش وەستاوە، خۆی بە نیگەران نیشان دەدات و درۆت لەگەڵ دەکات تا خۆیت لێ دەرباز بکات ڕووکاری خۆیت لێ بشارێتەوە، هەر لەبەر ئەوەش بوو بە هاوارەوە دەستی قسە کرد. بەڵێ، پاڵەوانەکەمان کە لە ڕێگای ماڵەوەدایە، کاتێ کە ئافرەتێکی بە حورمەت لە ناوەڕاستی ڕێگادا ئەوی ڕاگرت و پرسیاری ڕێگای لێ کرد، بە ترسەوە سەیری دەوروبەری خۆی دەکرد، بە ڕووگرژییەوە دەڕۆیشت و بە زەحمەت تێبینی ئەوەی دەکرد کە زیاتر لە ڕێبوارێک زەردەخەنەی بۆ دەکەن و ئاوڕی لێ دەدەنەوە. لەگەڵ ئەوەشدا کچێکی وردیلە بە پێشیدا تێدەپەڕێت و بە دەنگی بەرز پێ دەکەنێت و بە چاوە گەشاوەکانییەوە تەماشای زەردەخەنە تێڕاماوییەکەی و جووڵەی

ئەندامەکانی دەکات، بەڵام "ئارەزوو" گاڵتەجارییە هەڵفڕیوەکانی خۆی دەدات بەسەر خانمە بەتەمەنەکە و ڕێبوارە بەمەراقەکان و منداڵە بە پێکەنینەکە و ئەو جوتیارانەش کە لە ناو بەلەمەکانیان لە فۆنتانا دەخەون (وا دابنێین، پاڵەوانەکەمان، بە درێژی ڕووبارەکە پیاسە دەکات)، بە میزاجێکی دەمدەمییەوە بە دەست سڵاو لە هەموو کەسێک و هەموو شتێکی ژێر چادرەکانی ناو بەلەمەکان دەکات کە وەک ئەوەی مێشوولەیەک بێت کەوتبێتە داوی جاڵجاڵۆکەوە. پاش ئەو کاتە ئەم پیاوە سەیرە بە مێشکێکی ساف گەڕاوەتە ماڵەوە تا نانی ئێوارە بخوات، دانیشت و نانی خوارد، ئەم نانخواردنەی وای لێ کرد کەمێک بێتەوە سەرخۆی، لەو ماوەیەدا "ماترۆنا" لەوێ دەوەستا (هەمیشە بە تێراماوی و بە بێزارییەوە) مێزەکەی خاوێن دەکاتەوە و دار جگەرەکەشی دەداتێ، پاشان هەست و بیری دێتەوە سەر خۆی و بەسەر سوڕماوییەوە بەبیری دێتەوە کە نانی ئێوارەی خواردووە، هیچ ئاگای لێ نەبووە کە ئاخۆ چۆن نانی خواردووە. ژوورەکەی تاریک داهاتووە و دڵیشی خەمناکە، تەواوی شانشینی ئارەزووەکان بەلای ئەوەوە پارچە پارچە و وردوخاش بووە، بە بێ شوێنەوار، بە بێ دەنگ، ورد و خاش بووە، وەک خەون لە شەقەی باڵی داوە و ڕۆیشتووە، خۆشی نازانێ کەوا کەی خەیاڵی کردووە و خەونی بینیوە، بەڵام هەستێکی ئاڵۆز بە کزی دڵی داگیر دەکات و ئازاری پێ دەگەیەنێ، هەندێ غەریزەی تری نوێ ختووکەی ئەم ئارەزووەی دەکەنەوە و هەر بە ئاستەم هەندێ تارمایی لە ژوورەکەیدا دەورووژێنن، هێمنی باڵ بەسەر ژوورەکەی دادەگرێت، خەیاڵیش بەهۆی تەنیاییەوە دنە دەدرێت، کە زۆر بەکزی وەک ئەو ئاوەی کە "ماترۆنا" لە ژوورەکەی





تەنیشتیدا قاوەی پێ دەکوڵێنێت بە بڵق دێت. ئێستا ئەو هێمنییە بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ نامێنێ، کاتێک بێ مەبەست و هەروا کتێبێک کە خەیاڵپڵاوەکەمان بە دەستی گرتووە، پێش ئەوەی بگاتە لاپەڕەی سێیەم لە دەستی بەردەبێتەوە، خەیاڵەکانی دیسان تێک دەقژقژێنەوە و بەکار دەکەونەوە، دیسان دونیایەکی نوێ، ژیانێکی دڵڕفێن لەبەر دەمیدا وەک دیمەنێک دەکرێتەوە، خەیاڵێکی بێگەرد، بەختەوەرییەکی بێگەرد، هاتنی ژەهرێکی بێگەرد، ژیانی ڕاستەقینە بۆ ئەو چ نرخێکی هەیە؟! ناستینکا، من و تۆ لەبەر چاوی ئەودا زۆر زەغەل و زەنتەین، لەبەر چاوی ئەودا ئێمە هەموومان بەو قەدەرەی خۆمان ناڕازین، زۆر هیلاک و ماندووین لە ژیان! لە ڕاستیدا، ببینە چۆن لە یەکەم نیگاکردنا هەموو شتەکان ساردو ڕەزا قورسن، وەک ئەوەی شتەکان دەمدەمی بن لەنێو ئێمەدا، بەڵێ، خەیاڵپڵاوەکەمان بەرامبەر بە ئێمە بەو جۆرە بیردەکاتەوە، سەیر نییە گەر ئەو وا بیردەکاتەوە!

تەماشای ئەو تارماییانە بکە، کە زۆر بە ئەفسووناوی و سەرنج ڕاکێشەوە زۆر دەمدەمی و بێ دەربەستانە وەک وێنەیەکی جوولاوی جادوویی کە بەرچاوترین بەشی ئەو وێنەیە خۆیەتی، بێگومان کە دەڵێین "خۆی" مەبەستمان پاڵەوانەکەمانە، بە کەسایەتییە بەهادارەکەیەوە. ببینە چ سەرکەشییەکی هەمەجۆر و خەیاڵێکی دڵخۆشکەری بە لێشاو و بێ کۆتاییە! لە وانەیە تۆ پرسیار بکەی ئەو خەیاڵی چی دەکات و بیر لە چی دەکاتەوە؟ بۆچی ئەو پرسیارە دەکەیت؟ (بۆچی)یەکانی هەموو شتێک، هی چارەنووسی ئەو شاعیرەی کە سەرەتا نەناسرا بەڵام دواتر تاجە گوڵینەی ڕێزلێنانیان پێ بەخشی، یا (بۆچی)ی هاوڕێیەتی "هۆفمان" و "شەوەکانی سەینت

پارپیلموی" یا هی "دایانا ڤیرۆن"، یا هی ئەو پاڵەوانەی کە ڕۆڵی بردنی "کازان" دەگێڕێ و لە لایەن "ئیڤان ڤاسیلیڤیچ"ەوە نووسراوە، هی "کلارا ماوبرەی"، یا هی هەڵسانەوەی مردووەکان لە "ڕۆبێرتی شەیتان" (ئایا موزیکەکەیت لەبیرە، کە بۆنی گۆڕستانی لێ دێ) یا هی "مینا و بریندا" یا هی شەڕەکانی "برزینیا"، یا خوێندنەوەی هۆنراوەیەک لە سەر خاتوونی "ڤی.دی" ی دانتۆن، یا هی "کیلۆپاترا ئی سوا ئامانتیّ"، یا هی خانووە بچووکەکەی "کۆڵۆمنا"، یا هی ئەو خانووە بچووکەی کە کەسێک خاوەنییەتی و ئەو خاوەنەشی کەسێکی بەڕێزی لە تەنیشت دانیشتووە و گوێی لێ ڕادەگرێ لە ئێوارەیەکی زستاندا، دەمە بچووکەکەی و چاوەکانی کردۆتەوە هەروەک چۆن تۆ ئێستا گوێت لە من گرتووە، ئەی فریشتەی ڕزگاریم.... نەخێر ناستینکا، لە ژیانی ئەودا چی هەیە؟ لەو ژیانە نەمرونەژیەی ئەودا چی هەیە؟ کەوا من و تۆ هەمیشە دەممان داپچڕیوە و هەمیشە ئارەزووی شتی زیاتر دەکەین؟ ئەو وا بیردەکاتەوە کە ئەو ژیانە جێی بەزەیی پێدا هاتنەوەیە، بەڵام نەک بۆخۆی جێی بەزەیی پێدا هاتنەوە بێ، لەوانەیە ڕۆژێ بێت لەم ژیانە بەستەزمانەدا هەست بە مات و مەلوولی بکات، هەموو ئەو ساڵانەی کە لە فەنتازیادا ژیاوە بیبەخشێ، نەک تەنها بیبەخشێ لە پێناوی خۆشی و بەختەوەریدا بەڵکو بە بێ جیاوازیکردن لە پێناوی ساتە خەمناک و پڕ لە پەشیمانییەکانیشدا بیبەخشێ.

تا ئێستا کە لە ژوورەکەی دانیشتووە هەڕەشە نەگەیشتۆتە جێ، ئەو ئارەزووی هیچ ناکات لەبەرئەوەی ئەو خۆی باڵادەستە بەسەر هەموو ئارەزووەکاندا، لەبەرئەوەی ئەو تێربووە لەو ئارەزووانە، ئەو خۆی





دروستکەری ژیانی خۆیەتی، خۆی هەموو کاتژمێرێکی خۆی وا لێ دەکات بە گوێرەی هەوەسەکانی خۆی بێت. خۆت دەزانی ئەم دونیا ئەفسانەیە چەندە بە ئاسانی دروست دەکرێت! وەک ئەوەی خەیاڵ نەبووبێت، لە ڕاستیدا ئەو هەندێ سات ئامادەیە کە باوەڕ بەخۆی بێنێ کە ئەو ژیانە لەلایەن هەستەوە نییە و تراویلکە نییە، یا ئەندێشە نییە، بەڵکو پێی وایە ئەو ژیانە ژیانێکی بەرجەستە و ڕاستی و واقیعییە. بۆچی ناستینکا؟! بۆچی مرۆڤ کاتێک کە ئەم ساتانە دەبینێ ئیدی هەناسەبڕکێ دەبێ؟ بۆچی و بە چ جادوویەک و بە ڕێگای چ هەوەسێکی نادیار و نەزانراو ئەم ئارەزووە خێراتر دەبێت و فرمێسک لە چاوانی خەیاڵپڵاوەکەدا دەبارێ، لەکاتێکدا کوڵمە زەرد هەڵگەڕاوەکانی دەگەشێتەوە، یا لە کاتێکدا سەراپای بوونی لەگەڵ هەستێکی دەرنەبڕدراوی دڵنەواییدا ڕیشاڵ ڕیشاڵ دەبێ؟ بۆچی ئەو شەوانەی کە خەو لە چاویا زڕاوە وەکو برووسکەیەک لە خۆشی و بەختەوەری تەواونەبوو تێدەپەڕێت، کاتێ کە گزنگی بەرەبەیان لە پەنجەرە دێتە ژوورەوە و کازیوە بە لێشاوێکی سەیر خۆی دەکات بە ژوورە خەمناکەکەیدا، هەروەک لە پترسبۆرگیشدا وایە، خەیاڵپڵاوەکەی ئێمە ماندوو و هیلاک، لەگەڵ دڵشادییەکی خرۆشێنەر لە ڕۆحە پەستەکەی و ئێشێکی شیرین و ماندوو لە دڵیدا خۆی بەسەر جێگاکەیدا دەداتەوە؟ بەڵێ ناستینکا، کەسێک فێڵ لە خۆی دەکات و بێ ئاگایانە باوەڕ بەخۆی دەکات کە ئەو عیشقە ڕاستە لە ڕۆحیدایە، کەسێک بێ ئاگایانە باوەڕ بەوە دەکات کە شتێکی زیندوو و بەرجەستە لە خەون و خەیاڵەکانیدایە. ئایا ئەوە وەسوەسەیە؟ بۆ نموونە خۆشەویستی، لەناو سینگی ئەودا بەستراوەتەوە بە خۆشییە

لە سنوورنەهاتووەکانی و ئازار و ئەشکەنجەکانی، بەس تەماشای بکە ناستینکای ئازیز، هەرگیز نەیزانیوە لە خەونە ڕەنگینەکانیدا کێی خۆش دەوێ؟ ئایا دەکرێ لە خەیاڵەکانیدا تەنها لەکاتی دەستبازی و فریودانییەوە خۆشەویستەکەی دیبێ کە ئەم جۆرە خۆشەویستییەش هیچ نییە جگە لە خەون نەبێت؟ کە ئەو بە دڵنیاییەوە دەبوایە خۆی و خۆشەویستەکەی بە فەرامۆشکردنی هەموو دونیا و لەگەڵ دروستکردنی یەکێک لە هەردووکیان زۆر دەمێکبا هەردووکیان پێکەوە قۆڵ لەنێو قۆڵ ژیانیان بەسەر ببردایە. کە ساتی دابڕانیش بێت کچەکە لە سینە و باوەشی ئەودا بدات لە هەنسکدان و لەپڕمەی گریان، خەفەت بخوات. بێئاگا لەو گێژەڵووکەی کە لە ژێر ئاسمانی پڕ لەقیندا هەڵدەکات، بێئاگا لەو بایەی کە فرمێسک لەسەر برژانگە ڕەشەکان لادەبات، دەکرێ ئەو هەموو شتانە خەون و خەیاڵ بن، ئەو باخچەیەش خەیاڵ بێ کە خەمبار، وازلێهێنراو، تاریک لەگەڵ ڕێچکە جۆرەی بە کەڕوو داپۆشراو، تەنیا و خەمناک کە ئەوان عادەتیان پێ گرتبوو بەیەکەوە پیاسەی تێدا بکەن، کە بەیەکەوە لەوێدا هیوایان هەبوو، خەمیان خواردبوو، بۆ ماوەیەکی درێژ زۆر بە شەیدایانەوە یەکتریان خۆش ویستبوو.

ئەو خانووەی کەوا کچەکە سالآنێکی بە تەنیایی و خەمناکی لەگەڵ هاوسەرە ڕوو گرژەکەی بەسەر بردووە، هاوسەرێکی بێدەنگ و میزاج خراپ، لەکاتێکدا وەکو منداڵی شەرمن خۆشەویستییان لە یەکتر شاردۆتەوە، چ ئازارێکە ئەوان دەیچێژن! چ ترسێکە پێیەوە گیرۆدەن! ئەو خۆشەویستییەی کە هەیانە چەندە بێ گوناه و بێ گەردە و ئەوانیش (زۆر لەخۆم دەکەم کە ئەوە دەڵێم ناستینکا) چەندە بە قینن!





ئای خوایە! بە دڵنیاییەوە دواتر پاش ئەو دابڕانە کە مێردەکەی چاوی بە خێزانەکەی دەکەوێتەوە لە باشووری شارێکی هەتا هەتایی، لە کۆشکێک کە لە دەریای تیشکەکان و ڕووناکیدا نقوم بووە، لەسەر باڵکۆنێکدا کە بە گوڵە باخ و پوونگ گوڵڕێژ کرابێت، کاتێ کە ژنەکە مێردەکەی دەناسێتەوە بەپەلە ئەو دەمامکەی کە خۆی پێ داپۆشیوە لای دەدات و پستەپست دەکات"من ئازادم" بە لەرزە لەرز خۆی بە باوەشیدا دەدات و لەگەڵ هاواری خۆشیدا لە ئامێزی یەکتردا خۆیان دەبیننەوە، لە پڕ هەموو خەم و ئازار و دابڕانەکانیان لە بیر دەکەن، بەڵێ، لە پڕ خانووە خەمناکەکە و پیاوە پیرەکە و باخچە تاریک و وازلێهێنراوەکە لەبیر دەکەن، ئەو جێگەیەش کە کچەکە لە دواهەمین ماچی عاشقانەدا بە ڕەشبینی و ناخۆشییەوە خۆی لە باوەشیدا دەرکردبوو، ئای ناستینکا! پێویستە دان بەوەدا بنێی کاتێ کەسێک خیانەت لە دەربڕینەکانی دەکات وەکو ئەو منداڵە قوتابییەی کە سێوێکی لە باخچەی دراوسێکەیان دزیوە سوور هەڵدەگەڕێت، کاتێ خاوەن ماڵەکە خۆی دەکات بە ژووردا هاوار دەکات وەک ئەوەی هیچ ڕووی نەدابێت دەڵێ"کوڕی بەڕێزم، ئێستا لە پاڤلۆڤسکەوە هاتووم".

ئای خوایە! خانەدانە پیرەکە دەمرێت، خۆشییەکی دەرنەبڕدراو نزیک دەبێتەوە، خەڵکیش لە"پاڤلۆڤسک" دەگەنە جێ.

بەشێوەیەکی بەزەیی جوولێن قسەکانم تەواو کرد، دواتر بە خرۆشانێکی یەکجار زۆرەوە وەستام، بە بیرم دێتەوە ئارەزوویەکی سەیرم هەبوو بۆ زۆر لە خۆکردنم بۆ پێکەنین، لەبەرئەوەی هێزێکی خراپی شەیتانی گێنگڵی پێ دەدام، دەتگوت ئێسک لە قوڕگم گیربووە، مووچڕک بە چەناگەمدا دەهات و چاوەکانیشم تا دەهات گەورەتر

دەبوون و دەگەشانەوە، وام چاوەڕوان کرد ناستینکا کە تا ئەوکات چاوەکانی گەش کردبۆوە و گوێی بۆ گرتبووم، دەداتە پێکەنینە منداڵانەییەکەی، لە لایەن خۆشمەوە هەستم بە پەشیمانییەک کرد لەوەی کە زۆر لە باسەکەدا دەرچووبووم و هەندێ شتی ناپێویستیشم باس کرد کە لە دڵمدا گێنگڵیان خواردبوو، کە وا قسەم دەکرد دەتگوت لەسەر کاغەز دەیخوێنمەوە، لەبەر ئەوەی زۆر لەمێژبوو بڕیارم دابوو کە ئەو شتانە باس بکەم، کەچی ئێستاش نەمدەتوانی بەردەوام بم و درێژەی پێ بدەم و دان بە هەموو شتەکانی خۆم دابنێم بە بێ ئەوەی چاوەڕێ بکەم کەسێک هەبێ لێم تێبگات، بەڵام بە پێچەوانەی لێکدانەوەکەم ئەو بێ دەنگ بوو پێنەکەنی، کەمێک چاوەڕوانی کرد، پاشان بەهێواشی دەستەکانمی گوشی، بە بەزەییەکی شەرمنانەوە گوتی:

– بەدڵنیاییەوە لە هەموو تەمەنتدا وا نەژیاوی؟

– ئەوە هەموو ژیانمە ناستینکا، ئەوە هەموو ژیانمە، بۆ من وا دێتە بەرچاو کە هەر بەم شێوەیەش بەردەوامی پێدەدەم تا کۆتایی.

بە قورسییەوە گوتی:

– نەخێر، هەرگیز نابێ لە داهاتوودا ژیانت بەو شێوەیە بێ، لەوانەیە من ژیانی خۆم لەتەک داپیرەمدا بەسەر بەرم. دەزانی ئەگەر بەو جۆرە بژیت باش نییە؟

چیتر نەمتوانی دان بەهەستەکانی خۆم دابگرم و بەتوندی گوتم:

– دەزانم ناستینکا دەزانم، ئێستا لەجاران زیاتر دەزانم و دەرک بەوە دەکەم کە باشترین ساڵانی ڕابردوم لەدەست داوە، ئێستا زیاتر





هەستی پێ دەکەم بە هۆی ئەوەی کە خوا تۆی بۆ من ڕەوانە کردووە، ئەی فریشتەی ڕزگاریم، خوا تۆی بۆمن ڕەوانە کردووە تا پێم بڵێی کە من ساڵانی ڕابردووم بەفیڕۆ چووە و نیشانم بدەی، ئێستا کە لە تەنیشت تۆدا دانیشتووم و قسە لەگەڵ تۆدا دەکەم بیر لە ئایندە دەکەمەوە کە بۆ من زۆر غەریبە، لەبەرئەوەی هەمیسان تەنیایی هەیە، هەمیسان گەنیوی و ژیانێکی بێ کەڵک هەیە، ئیدی من چیم دەبێ تا خەیاڵی پێوە بکەم کە لە واقیعدا ئەوەندە دڵخۆش بوومە بەدانیشتن لە گەڵ تۆدا! ئای کچی ئازیز، خوا دەست بەباڵاتەوە بگرێ لەبەر ئەوەی لەسەرەتاوە ڕقت لێم نەبووە و فەرامۆشت نەکردم، لەبەرئەوەی دوو ئێوارە ڕێت پێدام بژیم، ئاخ ناستینکا، ئایا دەزانی چەندە منت لەگەڵ خۆتدا ئاشت کردۆتەوە؟! ئایا دەزانی من ئێستا ئەوەندە بە کەم سەیری خۆم ناکەم کە بەر لە چەند ساتێک وابووم؟ ئایا دەزانی لەوانەیە واز لە شین و ڕۆڕۆکردن لە سەر گوناه و تاوانەکانی ژیانی ڕابردووم بێنم؟! چونکە ژیانی لەو جۆرەی وەک من هەر گوناه و تاوانە، واهەست نەکەی زیادەڕەوی لە قسەکانم دەکەم، نا، بۆ خاتری خوا وا هەست نەکەی ناستینکا، لەبەرئەوەی هەر کاتێک بێت ئەو ناخۆشییەی ڕابردوو بەسەرمدا زاڵ دەبێتەوە، چونکە بەلامەوە دیارە کەوا من هەموو پەیوەندییەکم لە دەست داوە، هەموو ئارەزووەکم بۆ حەقیقەت و واقیع لەدەست داوە، ئەویش چونکە لەکۆتاییدا نەفرەتم لە خۆم کردووە، یا پاش شەوە خۆشەکانم کاتە هەراسانکەرەکانم بۆ دەگەڕێتەوە، لە هەمان کاتدا ناستینکا، لە دەوروبەرتدا گوێت لە دەنگی خولانەوە و قەرەباڵغی دەبێ، مرۆڤ دەبینی کە ژیان بۆیان قەدەغە نییە و لای ئەوان ژیان وەک خەون و خەیاڵ تێناپەڕێت، بەڵکو ژیانیان

هەمیشە لە نوێبوونەوەدایە، هەمیشە لە گەنجیدایە، هەموو ساتێکیان لە گۆڕاندایە و هیچ ساتێکیان وەک ساتەکەی تریان نییە، لە کاتێکدا "ئارەزوو و خەیاڵ" هیچ ڕوحێکی تیدا نییە، بێزارکەرە، بە ئاسانی لە ناو دەبرێ، بەندەی سێبەر و بیروڕاکانە و بەستراوەتەوە بە کات و ساتەوە، بەندەی یەکەم هەورە کە بەری خۆری پترسبۆرگ دادەپۆشێ و دڵی پترسبۆرگ نیگەران دەکات، ئیدی ئارەزوو و خەیاڵ لە بەرامبەر پەستی و بێزاریدا چییە!؟ هەستیش دەکەی ئەم هەست و ئارەزووە لە سنوورنەهاتووە لە کۆتاییەکەیدا تاقەت پرووکێنت دەکات و کۆتایی دێت، چونکە کاتێ پیر دەبیت و بە تەمەندا دەچیت بیروڕا کۆنەکانت نامێنێ و لێت دادەبڕێت، ئەم بیروڕا کۆنانە وردو خاش دەبن و دەبن بە تۆز و خۆڵ، ئەگەر ژیانێکی تر نەبێت، دەبێ مرۆڤ لەو ورد و خاشبووە و تۆزوخۆڵە بنیات بنرێتەوە، لە هەمان کاتدا ڕۆحیش ئارەزووی شتی دیکە دەکات! کەسی خەیاڵپلاو بێ هوودە دەست بەهەڵدانەوەی لاپەڕەی بیرەوەرییەکانی ڕابردووی دەکات، وەک ئەوەی لە نێو خۆڵەمێشدا بە دوای پشکۆیەک ئاگردا بگەڕێت تا فووی پیا بکات و بیەوێ بڵێسەداری بکات و خۆی بەم ئاگرە گەرم بکاتەوە، دەیەوێ وریا بێتەوە لە نێو ئەو هەموو یادەوەرییانەی کەوا شیرین بووینە و دڵیان وەجۆش هێناوە خوێنیان بەکوڵ هێناوە، یا ئەو یادەوەرییانەی فرمێسکی بۆ هەڵڕشتوون، کە سەرەنجامیش ئەویان هەڵخەڵەتاندووە خۆی دڵخۆش بکات، دەزانی ناستینکا ئەو خاڵەی من پێی گەیشتم چییە؟ ناستینکا، ئەوەیە کە من ناچار دەبم ئاهەنگی ساڵیادی هەستەکانم بگێڕم، هی ئەوەی کە وا جارێک لە جاران شیرین بووینە و هەرگیز لە واقیعدا بوونیان نەبووە (چونکە





یادەوەرییەکانی ئەم ساڵیادە لە خەیاڵە گەمژانەییەکەمدا دەمێنێت) بۆیە ئەوە دەکەم تا چیتر خەیاڵی گەمژانەم نەمێنێت لە داهاتوودا، چونکە لەگەڵیاندا هیچ بەدەست ناهێنم، خۆت دەزانی خەیاڵیش لە پێناوی هیچدا نایەت! ئایا دەزانی ئێستا حەز بە وەیادهێنانەوەی ئەو سات و شوێنانە دەکەم کە جارێ لە جاران تیایدا دڵخۆش بوویمە؟ دەمەوێ ئێستای خۆم بە هارمۆنیا بنیات بنێم لەگەڵ هەڵوەشانەوەی ڕابردووم، زۆربەی کات وەکو سێبەرێکی بێ مەبەست و خەمناک و بێزار بە شەقام و کۆڵانەکانی پترسبۆرگدا پیاسە دەکەم، ئەم یادەورییانە چ یادەوەرییەکن تا بەیاد خۆتی بێنییەوە! بۆ نموونە، هەر ساڵێک بەر لە ئێستا، هەر لەم کات و ساتەدا هەر لەم شۆستەیەدا بە تەنیا پیاسەم دەکرد و خەمباریش وەک ئەمڕۆ، کاتێ کەسێ بەیادی دێتەوە کە خەیاڵەکانی ڕابردووی خەمناک بووینە، هەر چەندیشە ڕابردووی باشتر نییە لە ئێستای، بەڵام هەر بەیادی دێنێتەوە وەک ئەوەی ئەو ڕابردووە بۆ ئەو باشتر بێت، تیایدا ئاسوودەتر بێت، یا ئەو کات ئازاد بووبێت لەو هەستە ڕەشەی کە ئێستا سەراپای جەستەی داگیر کردووە، یا لە ئازاری ویژدان ئازاد بووە (ئەو ئازارەی کە بە شەو و بە ڕۆژ ئارامیت لێ دەبڕێنێت). کاتێک کەسێک لە خۆی دەپرسێت کوا خەیاڵ و خەونەکانی؟ یا سەری بادەدا و سەری دەلەقێنێ و دەڵێ "ئای، ساڵەکان چەند بە خێرایی تێپەڕین!" یا لە خۆی دەپرسێ "ئەو چەند ساڵەی کە لە تەمەنیدا تێپەڕیوە چی کردووە؟ ڕۆژە خۆشەکانی خۆی لە کوێ ناشتووە؟ ئایا ئەو ماوەیە ژیاوە یا نا؟" تەماشا بکە ناستینکا، کەسێ هەیە لە خۆی دەپرسێ ئەم دونیایە چەند بە ساردی گەشە دەکات! چەند ساڵێک تێدەپەڕێت خەمناکی

تەنیایی بە دوا دێت، پاشان تەمەنی پیری دێت کە بەسەر گۆچانەکەیەوە دەلەرزێت، پاش ئەوەش پەژارە و نەمان و وێرانبوون، ئیتر دونیا ڕەنگینەکەی سیس دەبێ و خەونە جوانەکانی دەوەرێ، هەروەک چۆن گەڵای پاییز لە درەختەکاندا دەوەرێت. ئای ناستینکا، دەزانی چەندە خەمناکە بە تەنیا بمێنیتەوە، تەنیای تەنیا، بگرە تا شتێکیش نەبێ بۆی پەشیمان ببیتەوە و خەفەتی بۆ بخۆی، هیچ شت، هیچ..... چونکە هەموو ئەو شتانەی لە دەستت داوە هیچ بووە، گەمژەیی بووە، پووچێتی بووە، بەڵێ هیچ نەبووە، بەس خەیاڵ بووە.

ناستینکا ئەو فرمێسکانەی سڕییەوە کە کەوتبووە سەر گۆناکانییەوە گوتی:

– تکایە چیتر هەستەکانم مەبزوێنە، ئێستا هەموو شت تەواو هەردووکمان بەیەکەوە دەبین، ئیدی هەر شتێک ڕوودەدات با ڕووبدات، ئێمە هەرگیز واز لەیەکتر ناهێنین، گوێ بگرە من کچێکی سادەم، ئەوەندە ڕۆشنبیرییەم نەبووە، هەرچەندە داپیرم مامۆستایەکی بۆ گرتبووم، بەڵام من لە هەموو ئەو شتانەی کە وەسفت کرد تێدەگەم، ئەو شتانە، هەر لەو کاتەی داپیرەم جلەکانمی بەپەتێک بە جلەکانییەوە بەستاوەتەوە لە ناخی منیشدا هەبوونە، بیگومان من وەک تۆ پێم وەسف نەدەکرا و پێم دەرنەدەبڕدرا، من کچێکی ڕۆشنبیر نیم.

ئەوەندەی بە شەرمەوە گوت، چونکە هێشتا لە لۆژیکی قسەکانم و درێژی شێوازەکەم هەستی بە ڕێزێک دەکرد، دواتر گوتی:

– خۆشحاڵم بەوەی کە لە گەڵمدا زۆر کراوە بووی، من ئێستا تۆ بە قووڵی دەناسم، دەزانی چی؟ منیش دەمەوێ ڕابردووی خۆمت بۆ بگێڕمەوە، هەموو ڕابردووی خۆم بە بێ پەردەپۆشی لێکردن و





شاردنەوە، پاش ئەوەش کە تەواو بووم دەبێ ئامۆژگاریم بکەی، تۆ کەسێکی زۆر زیرەکی، پەیمانم پێ دەدەی کە ئامۆژگاریم بکەی؟

– ناستینکا، هەرچەندە من هەرگیز ئامۆژگاری کەسم نەکردووە، بگرە تا ئامۆژگاری هەستیاریش، بەڵام ئەگەر وابڕوا وا دەبینم بارەکە زۆر هەستیار دەبێ، هەریەکەمان بڕێکی زۆر ئامۆژگاری هەستیار بە یەکتری دەدەین! باشە ناستینکای جوانم، چ جۆرە ئامۆژگارییەکت دەوێ؟ هەر ئێستا بێ پێچ و پەنا پێم بڵێ، لەبەرئەوەی زۆر هەست بە دڵخۆشی دەکەم، هەست بە ئازایەتی دەکەم، کە لە دەربڕیندا دۆزینەوەی وشەم بۆ زەحمەت نییە.

ناستینکا بە پێکەنینەوە گوتی:

– نا نا، من تەنها ئامۆژگاری هەستیارم ناوێ، ئامۆژگاری برایانەشم دەوێت، دەڵێی بە درێژایی تەمەنت شەیدای من بوویت!

بە دڵخۆشییەوە گوتم:

– ڕازیم بەوەی ئامۆژگاری برایانەشت بدەمێ. بەڵێ ئەگەر بیست ساڵیش بەر لە ئێستا شەیدای تۆ بوومایە، ئەوا نەمدەتوانی ئەوەندەی ئێستا شەیدات بم...

– دەستەکانت بێنە!

دەستەکانم دایێ و گوتم:

– ئەوەتان.

– با دەست بە گێڕانەوەی ڕابردووم بکەین.

## رابردووی ناستینکا

– نیـوەی چیـرۆکی من پـێشـتـر دەزانی، لـەوەی کـەوا مـن داپیـرەیەکی بەتەمەنم هـەیە.

بە پێکەنینەوە گوتم.

– ئەی ئەگەر بەشی دووەمی چیرۆکەکەش وەک ئەوەیان کورت بێ..!

– بێ دەنگ بـە و گـوێ بگرە، بەر لە هـەمــوو شت دەبێ ڕازی بـی کـە ئیدی قسـەم پێ نەبڕی، ئەگینا لێم تێکەڵ و پێکەڵ دەبێ، دەی بەهێمنی گــوێ بگرە. من داپیــرەیەکی بە تـەمـــەنم هـەیـە، لەو کـــاتـەوەی کـــە کچۆڵەیەکی بچـووک بووم کـەوتوومەتە لای، لـەبارەی دایک و باوکیشم،





ئەوان مـردوون، وادیارە داپیـرەم سـەرەتا دەوڵەمـەنـدتر بووە لە ئێسـتـا، لەبەرئەوە هـەمـیـشـە ڕۆژە خـۆشـەکانی ڕابردووی بەیاد دێنێـتـەوە، ئەو زمانی فەرەنسی فێـرکردم و مامۆستایەکیشی بۆ گرتم، کە تەمەنم بوو بە پانزە ساڵ (ئێستا حـەڤدە ساڵم) وازم لە وانەکانی فەرەنسی هێنا، ئا لەو کـاتەدا بوو کـە من دەسـتم بە هـەرەپاسـی کـرد، ئیـتر لـەوەی کە هەرەپاسییەکەم چی بوو پێت ناڵێم، ئەوەندە بەسـە کە پێت بڵێم گرنگ نیـیـە! بـەیانیـیـەکـیـان داپیـرم بانگی کـردمــە لای خـۆی و گـوتی کـە لەبەرئەوەی ئـەو کوێرە و نـاتوانێ چیـتر چاودێریم بکات، بۆیە پـەتێکی هێنا و جلەکانمی بە جلەکانی خۆی بەستەوە، ئینجا گوتی تـا کۆتایی ژیانمان دەبێ بـەم شـێوەیە لـە تەنیشت یـەکتریدا دانیشـین، بێگومـان ئەمـە لە کاتێکدا کە من واز لە هاروهـاجـیـیـەکەم و هـەرەپاسـیـیـەکەم نەهێنم و نـەبمە کچێکی باش! لە ڕاسـتـیدا ئەسـتـەم بوو بمتـوانیبایە لەداپیـرەم ڕابکەم، دەبوایە لە تـەنیشـتـیـیـەوە کارم بکردبایە و دەرسم بخـوێندبایە، جـارێکیـان ویسـتم هەڵی خـەڵەتێنم، (فـیوکلا)م ڕازی کـرد کە بێ لە شوێنی من دابنیشێ، (فیوکلا) خزمەتکارمان بوو و کەڕ بوو، داپیـریشم لەو کاتەدا لەسـەر کورسـییەکەی نوسـتبوو، منیش چوومـە دەرەوە تا لەنزیکی مـاڵەوە هـاوڕێیـەکم ببینم، ئیـتـر بەناخـۆشی کۆتای هـات، کـــاتێ مـن لـەدەرەوە بووم داپیـــرەم خـــەبـەری ببـــۆوە، چەنـد پرسـیـارێکی کـردبـوو، وەک ئەوەی من هێـشـتـا بەهێـمنی لە جـێگای خۆمدا دانیشتبم، (فیوکلا)ش کەبینیبووی داپیرەم وا هەندێ پرسیاری لێ دەکـات بەڵام ئەو تێناگـا چی دەڵێت، ئیـدی نازانێ چی بکا پەتـەکە لێ دەکاتەوە و ڕادەکات....

لێرەدا ناسـتینکا لە قسـەکانیدا وەسـتا و دەسـتی بە پێکەنین کـرد،

منیش لەگەڵی دەستم بەپێکەنین کرد، بەڵام ئەو لەپڕ لەپێکەنینەکەی وەستا و گوتی:

پێت دەڵێم بە داپیرەم پێنەکەنی ها! من لەبەرئەوە پێدەکەنم چونکە کارەکە پێکەنیناوی بوو...چی بکەم...کە داپیرەم ئاوایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر خۆشمدەوێ. ئیدی تێگەیشتم کە دەبێ لە جێگەی خۆم دانیشم بێ ئەولا و ئەولا، پاش ئەمە ڕێم پێ نەدرا چیتر بجوولێم. ئا! لەبیرم چوو کە پێت بڵێم خانووەکەش هی خۆمانە واتە هی داپیرمە، خانوویەکی لە دار دروست کراوە، بەقەد داپیرم کۆنە و سێ پەنجەرەشی تێدایە، نهۆمێکیشی لەسەرەوە هەیە، کرێچییەکی نوێی هاتۆتە ناو.

من وام لێکدایەوە و گوتم:

– واتە ئێوە بەر لەو کرێچییە نوێیە، کرێچییەکی بەتەمەنتان هەبوو.

– بەڵێ، بێگومان کەسێک بوو لەتۆ زیاتر دەیزانی چۆن بێدەنگ بێ و زمانی بگرێت، لەڕاستیدا زۆر بەدەگمەن زاری هەڵدەهێنا و قسەی دەکرد، پیاوێکی پیری کەڕ و کوێر و شەل بوو، تا لە کۆتاییەکەی نەیتوانی لە ژیان بەردەوام بێت و مرد، پاش ئەو پێویست بوو لەسەرمان کرێچییەکی تر بدۆزینەوە و ژوورەکەمان بە کرێ بدەین، کرێی ئەو ژوورە و مووچەی خانەنشینی داپیرم هەموو ئەو شتە بوو کە هەمانبوو و پێی دەژیاین، بەڵام کرێچییە نوێیەکەمان لە بەختی ئێمە وا دەرچوو کەسێکی گەنج بێت، خەڵکی پترسبۆرگ نەبوو، هەر لەو کاتەی کە قەبڵەقەبڵی لەسەر داشکاندی نرخەکە نەکرد، داپیرەم ڕازی بوو بە بەکرێدانی بەو و بە هاتنی ئەو، هەر یەکسەر دوای ئەوەی کە هات داپیرم پرسیاری کرد: "پێم بڵێ ناستینکا، کرێچییەکەمان چۆنە،





گەنجە یان پیرە؟"

منیش نەمویست درۆ بکەم گوتمە داپیرم کە ئەو نە ئەوەندە گەنجە نە ئەوەندە بەتەمەنیشە.

داپیرەم پرسی:"ئایە پیاوێکی قۆزە؟" دیسان نەمتوانی درۆی لەگەڵ بکەم گوتم: "بەڵێ پیاوێکی قۆزە".

داپیرەم گوتی:"ئای، چەندە وەڕسکەرن، چەند وەڕسکەرن! کچم پێت دەڵێم، نابێ ئەم جۆرە کەسانە لای خۆمان ڕاگرین، ئاخر ئێستا خۆت نازانی چ سەردەمێکە! کرێچییەکی وەکو ئەو کرێچییە ئەوەندە قۆز و جوان بێ! کچم ئەو سەردەمە جیاوازە لەگەڵ سەردەمان و ڕۆژانی ڕابردوو".

داپیرم هەمیشە داخی دەخوارد بۆ ڕۆژانی ڕابردووی، لەبەرئەوەی لەڕۆژانی ڕابردوودا گەنجتر بوو، خۆر لە ڕۆژانی ڕابردوو گەرمتر بوو، خواردنی ڕۆژانی ڕابردوو ئەوەندە زوو تێکنەدەچوو، ئیدی هەموو شتێکی ڕۆژانی ڕابردوو بەلای ئەو گرنگ بوو! منیش هەرلە تەنیشتی ئەو بێ دەنگ دانیشتبووم و بیرم دەکردەوە" بۆچی داپیرەم پێشنیاری شتی لەو جۆرەم بۆ دەکات؟ لەبەرچی پرسیاری ئەوە دەکات کە ئاخۆ کرێچییەکەمان قۆزە یان نا؟" بەڵام ئیتر هەر ئەوەندە بیرم کردەوە و دواتر تەواو، بڕیارم دا بیر لە چنینی گۆرەوییەکەم بکەمەوە، دەستم کرد بە چنین، تەواوی قسەکانی داپیرەم لەبیرکرد.

بەیانییەکیان کرێچییەکەمان هات بمانبینێ و تا داوامان لێ بکات ژوورەکەی بۆیە بکات، خۆت دەزانی هەر شتەو شتی دیکەی بە دوادا دێ، داپیرەم زۆری لەگەڵ گوت، دواتر بە منی گوت:

– ناستینکا برۆ ئەو ژمێریارە (حاسیبە) لە ژوورەکەم بێنە.

منیش یەکسەر لە شوێنی خۆم یەک پێ قیت بوومەوە تا بچم ژمێریارەکە لە ژوورەکەیدا بۆ داپیرەم بێنم، بەڵام یەکسەر لەشەرمان سوورهەڵگەڕام، نازانم بۆچی لەبیرم کردبوو کەوا جلەکانم بەجلەکانی داپیرەم بەستراوەتەوە، دواتر لە جیاتی ئەوەی بەهێمنی پەتەکە لە جلەکەم بکەمەوە نەیەڵم کرێچییەکەمان ئەمە ببینێ کەچی یەکسەر بازم دا تا کورسییەکەی داپیرم جوولا، کاتێ کە زانیم ئەو لە هەموو شتێک تێگەیشت لەشەرمان زیاتر ڕەنگم سوور هەڵگەڕا، وا ئەبڵەق وەستام وەک ئەوەی گوللەم بەرکەوتبێ، لەو ساتەوە هەستم بە شەرمەزاری و ناخۆشییەکی زۆر کرد، نەمدەزانی ڕووم لەکام لا بکەم! داپیرەم دیسان گوتی:

– چاوەڕێی چی دەکەی کچم؟

ئیدی بارەکە زیاتر بەرەو خراپی ڕۆیی، کاتێک کرێچییەکە بینی کە من لەبەر ئەو شەرمەزار بوویمە، بەڕێزەوە چەمایەوە و چووە دەرەوە.

پاش ئە ڕووداوە هەر کاتێک لە مەمەڕەکەدا دەنگێکی بچووکم دەبیست، ئیتر هەر ئەوەتە نەدەمردم، وام لێک دەدایەوە" ئەوە کرێچییەکەیە" بە شپرزەییەوە جلەکانم لە جلەکانی داپیرەم دەکردەوە، وەکو خۆ ئامادەکرن بۆ هەر ڕووداوێکی تری لەوجۆرە، بەڵام ئەو بەبێ هاتنە ژوورەکەمان بە ڕاڕەوەکەدا تێدەپەڕی و هەرگیز نەدەهاتە ژوورەوە، دوو هەفتە تێپەڕی کرێچییەکەمان بە(فیوکلا)دا لە پارچە کاغەزێکدا نووسراوێکی ڕەوانە کرد، تیایدا نوسیبووی کەوا چەند کتێبێکی گرنگی بەزمانی فەرەنسی هەیە، ئەگەر بمەوێ بیانخوێنمەوە ئەوا کتێبی چاکن، منیش دەترسام داپیرەم ڕێم پێ نەدات ئەو کتێبانە





بخوێنمەوە نەوەک ئەقڵی خۆمی پێ لەدەست بدەم! بەڵام داپیرەم بە سوپاسیشەوە ڕازی بوو، بەس پرسیاری ئەوەی کرد ئاخۆ ئەم کتێبانە کتێبی چاک و باشن، خۆ ئەگەر کتێبەکان باسی شتی خراپ و شتی نارەوشتی تێدا بووایە، ئەوا گومانی تێدا نییە و جێگەی پرسیار نییە کەوا مرۆڤ لێیانەوە فێری شتی خراپ دەبێ. دواتر بە داپیرەمم گوت: "داپیرە، لەم کتێبانە چی فێردەبم ئەگەر کتێبی خراپ و نارەوشتی بن؟ چی لەم جۆرە کتێبانەدا نووسراوە؟"

ئەو گوتی: "ئاخ ناستینکا! هەموو ئەوەی کە لە ناویاندا باس کراوە ئەوەیە، چۆن پیاوانی گەنج، کچانی پاک و نەجیب دەسخەڕۆ دەکەن بە بیانووی ئەوەی دەیانەوێ بیانخوازن، یا لە ماڵ باوانیان دەریانبێنن بۆ دونیای جوانی خۆیان، پاشانیش چۆن ئەو کچە بەدبەختانە بە تەنیا بە دەستی قەدەر دەسپێرن، بە جەرگبڕترین شێوە بەڕەڵایان دەکەن، من کتێبی زۆرم خوێندۆتەوە کچم، ئەوەندە وەسفی وا جوانی تێدابوو کە وایان لێ دەکردی بەدرێژایی شەو نەخەوی و دابنیشیت و بچیتەوە خەیاڵەوە، جا بۆیە ئاگادارت دەکەمەوە کچم کە نەیانخوێنیتەوە. ئەو کتێبانە چین کە ئەو ڕەوانی کردووە؟"

گوتم:"داپیرە، ڕۆمانەکانی "وۆلتەر سکۆتن". ئەو گوتی: " ڕۆمانەکانی "وۆلتەر سکۆت"!؟ بەڵام بوەستە، ئایە هیچ فرتوفێڵی لەگەڵ نەکردوون؟ بزانە هیچ نامەیەکی خۆشەویستی لە قەدەکانی دانەناوە؟"

"نا داپیرە، هیچ نامەی خۆشەویستی تێدا نییە".

"بەڵام تەماشای ژێر بەرگەکان بکە، ئەو بێ مێشکانە هەندێ جار لەژێر بەرگی کتێبەکان دایدەنێن".

"تا داپیرە، هیچ لەژێر بەرگەکانیشدا نییە".

"ئێ، کەواتە زۆر باشە".

ئیتر من و داپیرەم دەستمان بەخوێندنەوەی "وۆڵتەرسکۆت" کرد، تا لەماوەی مانگێکدا نزیکەی نیوەی کتێبەکانمان خوێندەوە، دواتر ئەو کرێچییە کتێبی زیاتری بۆ ڕەوانە کردین، لەوانە کتێبەکانی "پوشکین"یشی بۆ ڕەوان کردین، تا وای لێ هات لە کۆتاییدا بەبێ کتێب هەڵم نەدەکرد، وازیشم لەو خەیاڵانە هێنا کە شوو بە شازادەیەکی چینی بکەم.

شتەکان بەم جۆرە بوون تا ڕۆژێکیان وا ڕێکەوت لەسەر پلیکانەی ماڵەوەدا لەگەڵ کرێچییەکەماندا ڕووبەڕوو ببمەوە، لەو کاتەدا داپیرەم بۆ هێنانی شتێک منی ڕەوان کردبوو، ئەو وەستا منیش لەشەرمان دەموچاوم سوور هەڵگەڕا، ئەویش لەشەرمان سوورهەڵگەڕا، هەرچەندە بەیانی باشی لێ کردم و پرسیاری داپیرەمی کرد کەچی پێکەنی. دواتر گوتی:

– کتێبەکانت خوێندۆتەوە؟

منیش وەڵامم دایەوە بەڵێ خوێندوومنەتەوە، ئینجا گوتی:

– کامەیانت لە هەمووان پێ باشتر بوو؟

گوتم:

– "ئیڤانهۆ" و ئەوانەی "پوشکین"یش، ئەوانەم پێ لە هەمووان باشتر بوو.

جا بەم جۆرە گفتوگۆکەمان لەو جاریدا بەوەندە کۆتایی هات.

هەفتەیەک دواتر، دیسان لەسەر پلیکانەدا ڕووبەڕووی یەکتری





بووینەوە ئەم جارەیان داپیرەم منی ڕەوانە نەکردبوو، بەڵکو خۆم ویستبووم بچم شتێ بۆ خۆم بێنم، کاتژمێر دووی دوای نیوەڕۆ بوو کە ئەو هەر لەو کاتانەدا دەهاتە ماڵەوە. گوتی:

"نیوەڕۆت باش".

منیش نیوەڕۆ باشم لێ کردەوە، دواتر گوتی:

"ئەوە تۆ ئەقڵت لەدەست داوە، بەدرێژایی ڕۆژ لەگەڵ داپیرەت دادەنیشی؟!"

کاتێ ئەو پرسیارەی کرد لە شەرمان سوور هەڵگەڕام، زۆر هەستم بریندار بوو، هەستم بە شەرمەزارییەکی زۆریش کرد، ویستم بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە یەکسەر بڕۆم، بەڵام بڕست و تاقەتم لەبەر بڕابوو نەمتوانی. گوتی:

"گوێ بگرە، تۆ کچێکی باشی، بمبوورە کە بەم جۆرە قسەت لەگەڵدا دەکەم، دڵنیات دەکەمەوە، هەروەک چۆن داپیرەت ئاسوودەیی تۆی دەوێ منیش ئەوەندە دەمەوێ تۆ ئاسوودە بیت، ئایا هیچ هاوڕێیەکت نییە سەردانی بکەی و بچیتە لای؟"

گوتم" نەخێر هیچ هاوڕێم نییە تەنها"موشینکای "هاوڕێم نەبی کە ئەویش بۆ"سیکۆڤ" ڕۆیشت."

ئەو گوتی:

"گوێم لێ بگرە، حەزدەکەی لەگەڵما بێی بۆ شانۆ؟"

"بۆ شانۆ! ئەی داپیرەم چی؟"

"دەتوانی بێی لەگەڵما، بێ ئەوەی داپیرەشت پێی بزانێ".

"نەخێر نامەوێ فێڵی لێ بکەم. خواحافیز".

"باشە خواحافیز".

ئەوەندەی گوت و هیچی تر، هەر ئەو ڕۆژە پاش نانی ئێوارە، هات بۆ بینینی ئێمە بۆ ماوەیەکی درێژ لەگەڵ داپیرەم دانیشت قسەی کرد، پرسیاری ئەوەی لێ دەکرد کە ئاخۆ چۆتە هیچ شوێنێک، یا ئایا هیچ دۆست و ئاشنایەکی هەبووە یان نا، لەپڕ لە داپیرەمی پرسی:

"ئەم ئێوارەیە ئۆپێرا نمایش دەکرێ، من جێگەم گرتووە لەوێدا، ئەمشەو "سەرتاشەکەی ئیشبیلیە" نمایش دەکرێ، چەند هاوڕێیەکم مەبەستیان بوو کە بێن، بەڵام دواتر ڕەتیان کردەوە، جا بۆیە پلیتەکانم لایە".

داپیرەم بەدەنگێکی بەرز گوتی:

" "سەرتاشەکەی ئیشبیلیە"! لەبەر چی هەمان شت نمایش دەکرێ کە لە ڕۆژانی ڕابردوو نمایش دەکرا؟!".

وەڵامی دایەوە:

"بەڵێ "سەرتاشەکە" هەمان سەرتاشی ڕۆژانی ڕابردوو"

لەم کاتەدا بە لاچاوێک نیگایەکی لێ کردم، زانیم مەبەستی لەو سەیرکردنە چییە، ئیدی سوور هەڵگەڕام، لەژێر گومانەوە دڵم کەوتە خورپە، داپیرەم گوتی:

"دڵنیابە دەزانم ئەمە هەر هی ڕۆژانی ڕابردووە، من خۆشم جارێکیان لە نمایشێکی تایبەتیدا دەوری "ڕۆزینا" م وەرگرت".

"حەزناکەی ئەمڕۆ بێیت بۆ ئەو ئۆپێرایە؟ یان پلیتەکانم بەفیڕۆ بڕوات؟"

"بە خۆشحاڵییەوە دەڕۆین، بەڵام بۆچی هەر ئێمە؟ ناستینکاش خۆ





هەر هیچ نەهاتۆتە شوێنی وا، با ئەویش لەگەڵمان بێت".

ئای خوایە، چ خۆشییەک بوو! یەکسەر خۆمان ئامادە کرد، جوانترین جلمان لەبەر کرد و بەڕێ کەوتین، هەرچەندە داپیرەم کوێر بوو بەڵام هەر حەزی دەکرد گوێی لە موزیکەکەی بگرێت، لەگەڵ ئەوەشدا، لەبەرئەوەی کەمێک بەتەمەن بوو بۆیە ئەوەی کە زۆر گرنگی پێ دەدا ئەوە بوو من دڵخۆش بکات. نەدەبوایە ئاگامان لە خۆ ببڕێت.

لەبارەی ئەوەی کە لەم شانۆی "سەرتاشەکەی ئیشبیلیە" هەستم چۆن بوو، پێت ناڵێم، بەڵام تەواوی ئەو ئێوارەیە کرێچییەکەمان زۆر بە جوانی تەمەشای دەکردم، زۆر بەجوانی قسەی دەکرد، یەکسەر زانیم کە دەیەوێ بەیانی تاقیم بکاتەوە بەوەی داوای ئەوەم لێ بکات بە تەنیا لەگەڵی بچم، ئیتر ئەو شەوە شەوی ڕابواردن و خۆشی بوو! زۆر بە شانازییەوە چوومە سەر جێگا، زۆر دڵخۆش، لە خۆشییاندا دڵم کوتەکوتی بوو، ئەو شەوە بە درێژای شەو لە خەودا لەسەر "سەرتاشەکەی ئیشبیلیە" هوڕێنەم دەکرد.

پاش ئەو ئێوارەیە چاوەڕوان بووم کە ئەو زیاتر بێ و بمانبینێ، بەڵام هەرگیز وا نەبوو، بەڵکو هەر بەتەواوی وازی لە سەردانیکردنی ئێمە هێنا، تەنها مانگی جارێک نەبێ دەهات، ئەویش بۆ بانگهێشتکردنی ئێمە بۆ شانۆ، پاش ئەو جارە کە لەگەڵ داپیرەم و ئەودا چووین دوو جاری تریش چووین، من لەوە نیگەران بووم، هەستم کرد ئەو داخ بۆ ئەوە دەخوات کە من مامەڵەی ڕەقم لەلایەن داپیرەمەوە لەگەڵ دەکرێ، ئیتر ئەوە هەموو هاتنەکەی بوو. ماوەیەک تێپەڕی، زیاتر ئارامییم لەبەر بڕا، هەتا توانای ئەوەم نەبوو لە تەنیشت داپیریشم دابنیشم یا بخوێنمەوە و کار بکەم، هەندێ جار پێدەکەنیم و

شتێکی بێمانام دەکرد تا بێزاری بکەم، یان جاری وابوو دەگریام، تا لە کۆتاییدا لاواز ببووم و زۆر نەخۆش کەوتم. وەرزی ئۆپێرا کۆتایی هات و کرێچییەکەشمان بە تەواوی لە سەردانیکردنمان وازی هێنابوو، هەر کاتێ ڕووبەڕووی یەکتر دەبووینەوە (بێگومان لەسەر پلیکانەکەدا) ئەو بەنەرمی وەک ڕێزێک بۆم دەچەمایەوە، وەک ئەوەی بیەوێ قسە نەکات، دواتر یەکسەر دەڕۆیشت و لە دەرگا دەچووە دەرەوە، هەر لەو کاتەشدا من لە ناوەڕاستی پلیکانەکەدا دەوەستام، سوور وەک تەماتە، لەبەرئەوەی لە شەرماندا خوێنی هەموو لەشم دەهات لە دەموچاوم کۆ دەبۆوە.

ئێستا ئیدی وا کۆتایی چیرۆکەکەم نزیک دەبێتەوە، هەر ساڵێک پاشتر لە مانگی پێنج کرێچییەکەمان هاتە لامان، بە داپیرەمی گوت کەوا کاری لێرە تەواو بووە و پێویست دەکات بۆماوەی ساڵێک بۆ (مۆسکۆ) بگەڕێتەوە، کاتێ کە ئەو قسەیەم بیست، لەسەر کورسییەکە لە جێگای خۆمدا وشک و نیوە مردوو بووم، داپیرە هیچی تێبینی نەکرد، ئەو کرێچییەمان پێی گوتین کە ئێرە بە جێ دێڵێ، دواتر بەڕێزەوە چەمایەوە و چووە دەرەوە.

لەو کاتەدا پێویست بوو چی بکەم؟ زۆر بیرم کردەوە و زۆر نیگەران بووم تا لە کۆتاییدا بڕیاری خۆم دا، ئەو بۆ ڕۆژی دواتر بەیانییەکەی دەڕۆیشت، منیش بڕیارم دا کە ئەم ئێوارەیە کاتێ داپیرەم دەخەوێ هەموو شت کۆتایی پێ بێنم، ئەوجا هەر واشم کرد، هەموو جلەکانی خۆم لەناو باوڵێکدا کۆکردەوە، بە هەڵگرتنی باوڵەکە کە زیاتر لە مردوو دەچووم لەوەی لە زیندوو بچم، بە پلیکانەکەدا سەرکەوتمە سەرەوە، باوەڕدەکەم نزیکەی کاتژمێرێک دانیشتبێتم لەسەر پلیکانەکەدا،





ئەوەندە نیگەران بووم و دەترسام! کاتێ کە دەرگای ژوورەکەم کردەوە، هاوارێکی لێ هەڵسا و وای زانی من تارماییم، بە پەلە ڕایکرد هەندێ ئاوی بۆ هێنام، لەبەر ئەوەی زۆر بە زەحمەت دەمتوانی هەڵسمە سەر پێ، دڵیشم زۆر بە خێرایی لێی دەدا و سەرئێشەشم گرتبوو، نەمدەزانی چی بکەم، کاتێ کە هاتمەوە سەرخۆم، باوڵەکەم لەسەر جێگای نوستنەکەی ئەو دانا، خۆشم لە تەنیشتییەوە دانیشتم، دەموچاوم خستە نێو دەستەکانم ئیدی دەستم کرد بە گریان، وا هەست دەکەم ئەو یەکسەر لە مەسەلەکە گەیشتبێت و زانیبێتی کە من بۆ وەکو مردوو خۆم کردووە بە ژوورەکەیدا، وا بە خەمباری تەمەشایەکی کردم دڵم خەریک بوو زیواڵ زیواڵ بێ.

ئەو گوتی: "گوێ بگرە ناستینکا، من ناتوانم هیچ بکەم، من پیاوێکی هەژارم، هیچ شوێنێکم نییە تا تیایدا بژیم بگرە تا کەلاوەیەکیش، ئەگەر من تۆ بخوازم ئەوا ئێمە چۆن دەتوانین بژین؟"

ماوەیەکی زۆر دانیشتین قسەمان کرد، تا لەکۆتاییدا تەواو تێکچووم و نیگەران بووم، پێم گوت کە من چیتر ناتوانم لەگەڵ داپیرەم بژیم و دەبێ لێرە ڕابکەم، نامەوێ چیتر لە تەک ئەودا دانیشم و جلەکانم بە پەتێک بە جلەکانییەوە ببەسترێتەوە، بۆیە ئەگەر ئەو حەز بکات حەز دەکەم بچمە (مۆسکۆ)، چونکە نەمدەتوانی بەبێ ئەو بژیم، شەرم شانازی و خۆشەویستی بەیەکەوە لە ناخمدا هاواریان لێ هەڵدەستا، بە ڕاچڵەکانێک کەوتمە سەر جێگاکە، زۆر لە ڕەتکردنەوەی دەترسام.

کەمێک بە بێ دەنگی دانیشت، پاشان هەڵسا و هاتە لام و دەستەکانمی گرت، گوتی:"ناستینکا، ناستینکای من گوێ بگرە،

سوێند بێ ئەگەر وادەی ژن هێنانم هات، بەو مانایەی ئامادەییم هەبوو بۆ ژنهێنان ئەوا تۆ بخوازم، تۆ ئەو کەسە دەبی کە بەختەوەرم دەکەی، دڵنیات دەکەمەوە تۆ تەنها کەسی کە دەتوانم لەگەڵتدا بەختەوەر بم، گوێ بگرە من دەچمە (مۆسکۆ) ساڵێک لەوێ دەبم، دەمەوێ شوێنێک بۆ خۆم دابین بکەم، کاتێ کە گەڕامەوە و زانیم تۆش هەر منت خۆش دەوێ، سوێندت پێدەدەم کەوا ئێمە دەتوانین بە یەکەوە بەختەوەر بین، بەڵام ئێستا ناگونجێ و من توانام نییە، ئێستا مافی ئەوەم نییە پەیمانت بدەمێ، باشە؟ دووبارە دەیڵێمەوە، ئەگەر ساڵێکیشم نەبێ ئەوا ماوەیەکی هەر پێ دەچێ، بێگومان ئەوە لە کاتێکدا کە کەسێکی تر بەسەر مندا پەسەند نەکەی، هەر بۆیەشە ئازایەتی ئەوەم نییە بە هەر جۆرە پەیمانێک بێ پابەندت بکەم".

ئیتر ئەوە هەموو ئەو قسانە بوو کە پێی گوتم، ڕۆژی دواتر ئەو ڕۆیشت، هەردووکمان وامان پێ باش بوو و ئارەزووی ئەویش بوو کە هیچ بە داپیرەم نەڵێین، ئێستا چیرۆکی من خەریکە تەواو دەبێ، وا ساڵێک تێپەڕی کردووە و ئەویش گەیشتۆتە ئێرە، سێ ڕۆژە لێرەیە و...وە.....

ئارامیم لێ بڕابوو بۆ بیستنی کۆتاییەکەی و بەدەنگی بەرز گوتم:

– وە.... چی؟

– وە تا ئێستا خۆی پێ نیشان نەداوم !

وا وەڵامی دایەوە کە دەتگوت جڵەوی ئازایەتی لە دەست داوە، دواتر گوتی:

– هیچ دەنگ و ڕەنگێکی نییە.





لێرەدا لە قسەکانیدا وەستا، بۆ خولەکێک بێدەنگ بوو و سەری خۆی نەوی کرد، دەموچاوی خستە ناو دەستەکانی و دەستی کرد بە هەنسکدان، ئەوەندەی تر ئازاری خستە دڵمەوە، من هەر بەلای کەمیش چاوەڕوانی کۆتاییەکی کراوەی فلیمێکی لەو جۆرە نەبووم.

بەشەرمەوە و بە دەنگێکی نەرمەوە گوتم:

– ناستینکا، بۆ خاتری خوا مەگری، لەوانەیە هێشتا نەگەڕابێتەوە و لێرە نەبێ...

– نا ئەو لێرەیە، دەزانم کە لێرەیە، بەر لەوەی ئەو بڕوات ئێمە ئێوارەکەی پەیمانمان بە یەکتری دا، هەموو قسەیەکمان بۆ یەکتری کرد و گەیشتینە ڕێکەوتنیش، هەر ئەو ئێوارەیە پاش قسەکردن، بە پیاسە بۆ سەر ئەو پردە هاتین، کاتژمێر دە دەبوو لەسەر ئەم جێگایەش دانیشتین، ئەو قسانەی کە بۆ منی دەکرد جێگەی دڵخۆشی بوو، ئیتر پاش ئەو قسانە من چیتر نەگریام، ئەو گوتی هەر کە گەڕامەوە یەکسەر سەردانی تۆ و داپیرەت دەکەم، ئەگەر تا ئەو کات ڕەتی نەکەمەوە و ئەوم هەر خۆشویست ئەوا دەربارەی هاوسەردارییەکەشمان بە داپیرم دەڵێین، ئێستا ئەو لێرەیە، دەزانم کە لێرەیە، کەچی هێشتا نەهاتۆتە لام!

لەسەر کورسییەکەم هاتمە خوارەوە بە دەنگێکی بەرز گوتم:

– خوایە! ئایا ناستینکا من لەو هەموو خەفەتەتدا هیچم پێ ناکرێ بۆت؟ پێم بڵێ ناستینکا، ئایا گونجاو نییە من بچمە لای؟

سەری بەرز کردەوە و گوتی:

– گونجاو بێ بچیتە لای؟!

یەکسەر لە قسەکانم پاشەکشەم کرد و گوتم:

– نا، بێگومان گونجاو نییە، بەڵام دەڵێم با نامەیەکی بۆ بنووسین.

بە توندی گوتی:

– نەخێر، ئەمە ناگونجێ، من ناتوانم ئەوە بکەم.

کاتێ کە ئەوەی گوت سەری خۆی دانواندە لایەک و سەیری منی نەکرد. منیش دەستم بە بیرۆکەکەی خۆمەوە گرت، گوتم:

– بۆ نەگونجاوە؟ بۆچی؟ بەڵام ئەمە دەگەڕێتەوە سەر جۆری نامەکە، واتە چۆن چۆنی دەنووسرێت، نامەی باش هەیە و نامەی تریش هەیە.... ناستینکا ڕاستت پێ دەڵێم و متمانەم پێ بکە، ئامۆژگاری خراپت ناکەم، دەتوانین بەیەکەوە نامەیەک ڕێک بخەین، تۆ یەکەم هەنگاو هەڵگرە، بۆ ئێستا ناینووسی؟

– ناتوانم، ناتوانم! ئەگەر من یەکەم هەنگاو هەڵگرم، ئەگەر وابکەم وەک ئەو کاتە دیاردەکەوێ کە زۆرم لێی دەکرد......

من کە بە زەحمەتی توانیم زەردەخەنەکەم بشارمەوە، گوتم:

– ناستینکای من، نەخێر، نەخێر ئەوە مافی خۆتە، لەبەرئەوەی ئەو خۆی پەیمانی بە تۆ داوە کە گەڕایەوە بێتە لات، لەگەڵ ئەوەشدا بەو هەموو شتەی کە تۆ باست کرد من وای دەبینم کە ئەو کەسێکی هەست جوان و خۆش مەشرەبە.

من بە لۆژیکی لێکدانەوە و قەناعەت پێکردنەکانم بەردەوام بووم لەسەر قسەکردن!

– چۆن ڕەفتاری کرد؟ خۆی پابەند کردووە بە بڕیارێک و گوتوویەتی ئەگەر ژنی هێنا ئەوا کەسی تر ناخوازێ جگە لە تۆ نەبێ، سەربەستی





تەواویشی داوە بە تۆ لەوەی ئەگەر ڕەتی بکەیتەوە، لە بارودۆخی وا تۆ بۆت هەیە هەنگاوی یەکەم بگریتە بەر، واتە نامەیەکی بۆ بنووسی و ئاگاداری بکەیتەوە، ئەوە مافی خۆتە، تۆ لەبارێکی تایبەت و جیاوازی، یان ئەگەر ویستیشت هەنگاوی دووەم هەڵگری بەوەی ئازادی بکەی لە پەیمانەکەی.....

– گوێ بگرە، چی دەنووسی؟

– نووسینی چی؟

– ئەو نامەیە!

– پێت دەڵێم چۆن دەینووسم، دەینووسم: بەڕێز......

– پێویستە بە(بەڕێز...) دەست پێبکەم؟

– بە دڵنیاییەوە پێویستە، هەرچەندە....... نازانم، وا هەست دەکەم.....

– باشە باشە، پاشان چی، بەردەوامبە.

– "بەڕێز: من پێویستە داوای لێبووردنت لێ بکەم بۆ...." بەڵام، نەخێر پێویست بە داوای لێبووردن ناکات، ڕاستی مەسەلەکە بەهانەی هەموو شتەکانە، بەسادەیی بنووسە (من ئەو نامەیەت بۆ دەنووسم، بمبەخشە ئەوەندە بێ ئارامم، لە تەواوی ئەو ساڵەدا لە هیوای گەڕانەوەی تۆ و چاوەڕوانیکردنی تۆدا دڵخۆش بوویمە، ئایا لەوەی کە ناتوانم لە گومانی ڕۆژێکدا دان بە خۆم دابگرم دەبێ سەرزەنشت بکرێم؟ ئێستا تۆ گەڕاویتەوە، لەوانەیە ڕای خۆت گۆڕیبێت، ئەگەر وایە، ئەوا ئەم نامەیە پێت دەڵێت کە من گلەییت لێ ناکەم و هەست بەخەمباری ناکەم، سەرزەنشتیشت ناکەم، لەبەر ئەوە ناتوانم

سەرزەنشتت بکەم چونکە هیچ دەسەڵاتێکم بەسەر دڵتدا ناشکێ و هیچ توانایەکم بەسەر دڵتدا نییە، ئەمە قەدەری منە!

دواتر گوتم لەگەڵ ئەوانەشدا دەنووسین:

تۆ پیاوێکی بەڕێزی، نە زەردەخەنەت بێت بەسەر ئەو دێڕە نائارامانەی نێو ئەو نامەیە و نە خۆشت پێ سەغڵەت بکە، لەبیرت بێت کە ئەم نامەیە لەلایەن کچێکی بەستەزمانەوە نووسراوە، کە تەنیایە، کەسێ نییە تا ڕێنموونی بکات، کەسێ نییە ئامۆژگاری بکات، خۆی هەرگیز ناتوانێ کۆنترۆڵی دڵی خۆی بکات، بەڵام لێم ببوورە (ئەگەر کەمێکیش بێ) گومان چۆتە دڵم، تۆ توانای سووکایەتی پێکردنمت نییە، دەزانم ئەم کارە هەرگیز لە تۆ ناوەشێتەوە، بگرە هەتا ئەگەر لە هەستیشتەوە بێ).

"ئەوەی کە زۆر خۆشویستراوە

تۆشی خۆشدەوێ"

ناستینکا چاوەکانی لە خۆشییان گەشایەوە و بە دەنگێکی بەرز گوتی:

– بەڵێ بەڵێ، ئەوە ئەو شتەیە کە من بیرم لێ دەکردەوە، تۆ بارە قورسەکەی سەر شانمت چارەسەر کرد، خوا تۆی بۆ ڕەوانە کردووم! سوپاست دەکەم، سوپاست دەکەم!

منیش کە زانیم دەموچاوە جوانەکەی لە خۆشییان گەشاوەتەوە هەستم بەخۆشی کرد.

– سوپاسکردن بۆچی؟ لەوەی خوا منی بۆ یارمەتیدانی تۆ ڕەوان کردووە؟





– بۆچی نا، بەڵێ بۆ ئەوەش.

– ئای ناستینکا! بۆچی کەسێک دەبێ سوپاسی هەندێ خەڵک بکات کە لەکاتێکدا لە گەڵیدا لە ژیاندا مابێ، من سوپاسی تۆ دەکەم لەوەی یەکتریمان ناسیوە، چونکە لە تەواوی ژیانمدا دواتر دەتوانم تۆ بەیاد بهێنمەوە.

– باشە، باشە ئەوەندە کیفایەتە، بەڵام ئێستا چیت پێ دەڵێم گوێم لێ بگرە، من و ئەو وا لەگەڵ یەکتریدا کۆک بووین هەر کە ئەو گەیشتە پترسبۆرگ، بە هۆی ناردنی نامەیەکەوە بە هەندێ لەو خەڵکە سادانەی کە ناسیاومانن و هیچ دەربارەی ئەو باسانە نازانن من ئاگادار بکاتەوە، ئەگەر نەیتوانی نامەشم بۆ بنووسێ، خۆ لە نامەدا هەموو شتێ ناگوترێ، ئەوا ئەو ڕۆژەی کە دەگاتە جێ بۆ شەوەکەی کاتژمێر دە لێرە دەبێ، بەڵێ ئێرەمان دانابوو بۆ بەیەکگەیشتن و چاوپێکەوتن، من دەزانم ئەو ئێستا گەیشتۆتە جێ بەڵام ئەوە سێیەم ڕۆژە کەچی هیچ نامەیەک، هیچ نیشانەیەکی لێوە دیار نییە، بۆ من گونجاو نییە بەیانییان داپیرەم بە جێ بێڵم، بۆیە تۆ سبەی بەیانییەکەی نامەکەم بدە بەو کەسانەی کە پێم گوتی، ئەوان خۆیان بۆی دەنێرن، ئەگەر وەڵامێکیشت دەست کەوت، ئەوا سبەی کاتژمێر دە بۆمی دێنیتەوە.

– نامەکە، کوا نامەکە، سەرەتا دەبێ نامەکە بنووسی! لەوانەیە هەموو ئەو کارانە بۆ دووبەیانی بێت.

ناستینکا بە کەمێک پەشۆکاوییەوە گوتی:

– نامەکە، نامەکە بەڵام....

ئەو قسەکانی تەواو نەکرد، لە سەرەتادا کەمێک ڕووی لێ وەرگێڕام،

وەکو گوڵ گەشایەوە، لەپڕ هەستم کرد نامەیەکم لەناو دەستمە، کە دیار بوو دەمێک بوو نوسرابوو و واژووشی لەسەر کرابوو بەڵام من هەر خەیاڵیشم لەسەری نەبوو، ڕابردوویەکی شیرین و ئاشنا لە مێشکمدا هاتوچۆی دەکرد.گوتم:

– ڕۆ ــــ ڕۆ ــــ ز ــــ زی ــــ ن ــــ نا ــــ نا

دواتر بەیەکەوە بە منگە منگ گوتمان:

– ڕۆزینا.

خەریک بوو لە خۆشییان باوەشی پێدا بکەم، لەو کاتەدا سەر کوڵمەکانی پەمبە هەڵگەڕابوو و پێکەنی، لە کاتێکدا فرمێسک وەک دەنکە مرواری لەسەر برژانگە ڕەشەکانیدا ڕاوەستابوو.

بە خێرایی گوتی:

– دەی ئەوەندە بەسە، ئێستا خواحافیز، ئەوەتاش نامەکە، ئەوەش ناونیشانەکە کە بۆی دەبەی، دووبارە خواحافیز، تا بەیانی دەتبینمەوە، تا بەیانی.

بە گەرمی هەردوو دەستەکانمی گوشی، سەری لەقاند و دواتر برووسکەئاسا بە شەقامەکەدا ڕۆیی، منیش بۆ ماوەیەکی درێژ ڕاوەستابووم تەمەشام دەکرد.

وشەکانی (تا بەیانی دەتبینمەوە، تا بەیانی)، تا لە بەرچاوان ون بوو، لە گوێچکەکانمدا دەزرینگایەوە.



## شەوی سێیەم

ئەمڕۆ ڕۆژێکی خەمناک بوو، ڕۆژێکی زۆر باراناوی بوو و تیشکی خۆر لە دەرەوە نەبوو، هەروەک ئەو پیریەی کە لەپێشمدابوو چاوەڕوانی دەکردم. کەوتبوومە ژێر کاریگەری بیرکردنەوەیەکی زۆر سەیر و خەمناک، کۆمەڵە پرسیارێک کە هێشتا ئاڵۆز بوون مێشکمیان قاڵ کردبوو، منیش وادیار بوو نە دەسەڵاتم هەبوو بە سەریاندا کە وەڵامیان بۆ بدۆزمەوە، نە دەمتوانی ئارامیان بکەمەوە، ئەوە بۆ من نەهاتووە کە ئەو هەموو ئاڵۆزییە لە مێشکمدا ئارام بکەمەوە!

ئەمڕۆ لەوانەیە چاومان بە یەکتری نەکەوێت، دوێنێ کاتێ کە خواحافیزی لێ کردم، هەورەکان لە ئاسماندا کۆبوونەوە و تەمێکی

زۆریش هەڵسا، من گوتم سبەی دەبێتە ڕۆژێکی ناخۆش کەچی ئەو بێ وەڵام بوو، ئەو نەیویست قسـه لەدژی ئارەزووەکانی بکرێت، بۆ ئەو ئەمڕۆ ڕۆژێکی گەش و ڕووناک بوو، یەک هەوریش چییە ناتوانی بەختەوەرییەکەی ئاڵۆز بکات. ئەو گوتی:

– ئەگەر باران ببارێت بەیانی یەکتر نابینین، لەبەرئەوەی من نایەم.

من وام هەست کرد کە ئەو گوێ بە بارانی ئەمڕۆ نادا، کەچی هێشتا نەهاتبوو. دوێنێ سێیەم چاوپێکەوتنمان بوو، سێیەم شەوی سپیمان....

ئاخر چۆن خۆشی و بەختەوەری لە کەسێکدا کۆدەبنەوە! دڵ چۆن پڕ دەبێ لە خۆشەویستی! لە کاتێکدا کەسێک بیەوێ دڵی خۆی خاڵی بکاتەوە، یا بیەوێ دڵخۆش بێ و هەموو شتێ لای شایەنی پێکەنین بێ! ئەم خۆشییە چەندە زوو وەکو نەخۆشی دەگوێزرێتەوە! دوێنێ لە قسەکانی ئەودا چەندە نەرمی بەدی دەکرا و چ هەستێکی میهرەبانانەی هەبوو بەرامبەر بە من! چەندە پەرۆش و بێ ئارام بوو و چەندە بە نەرمی هەوڵی دەدا ئازایەتیم پێ ببەخشێ، ئای، نازی بەختەوەری! من هەموو ئەو شتانەم بە شتێکی ڕاستی وەرگرت، وام بیرکردەوە کە ئەو....... بەڵام خوایە چۆن وام بیر کردەوە؟ چۆن دەکرێ من ئەوەندە کوێر بم لە کاتێکدا ببینم کەسێکی تر پێشتر هەموو شتەکانی بردووە و دەستی بەسەردا گرتووە؟! هیچ شتی ئەو بۆ من نییە، لە ڕاستیدا نە نەرم و نیانییەکەی و نە نیگەرانییەکەی و نە خۆشەویستییەکەشی....بەڵێ، خۆشەویستییەکەی بۆ من هیچ نەبوو تەنها خۆشییەک نەبێ ئەویش تا دیتنی کەسێکی تر بە زوویی، ئارەزوویەکی کاتی بوو بۆ لەخۆگرتنی من، ئەمانە هەمووی لە کاتێکدا





کە ئەو لە لایەکی تردا بەختەوەرە.....

دوێنێ، ئەو کاتێ خۆشەویستەکەی نەهات کە ئێمە چاوەڕوانمان دەکرد، کاتێ کە زانیمان چاوەڕوانی بێ سوودە، نێوچەوانی گرژ کرد و زۆر شەرمنتر و بێ هیواتر بە دەرکەوت، جوولەکانی، وشەکانی چیتر ئەوەندە نەرم و دڵخۆشکەر و گاڵتە ئامێز نەبوون یا بڵێین سەیر بوون، ئەو حەز و مەیلەی کە پێشتر لە مندا هەیبوو دوو قات ببۆوە، وەک ئەوەی بیەوێ چی بۆ خۆی ئارەزوو دەکات ئەویش بە من ببەخشێ، بێگومان ئەگەر لە وەدەستهێنانی ئارەزووەکەیدا سەرکەوتنی بە دەست نەهێنابا. ناستینکای من زۆر خەمبار و پەست بوو کە من وام هەست کرد لە کۆتاییدا زانیویەتی کەوا من خۆشم دەوێ، بەزەیی بەم خۆشەویستییە بەستەزمانەی من هاتۆتەوە، بەڵێ، ئێمە ئەو کاتە زیاتر هەست بە خەمباری و دڵتەنگی کەسانی تر دەکەین کاتێ کە خۆمان خەمبار و دڵتەنگ دەبین، هەستکردن بە خەمەکان تێکت ناشکێنێ بەڵکو تاقەت پڕووکێنت دەکات!

ئەمڕۆ ئێوارە کە چووم بە دڵێکی پڕ و بێ ئارامەوە چووم بۆ دیدەنی، هیچ پێشهاتێکی دڵتەنگ لە ئارادا نەبوو کە هەستی پێ بکەم لەوەی کە ئێستا هەستی پێ دەکەم، کە گەیشتمە ئەوێ بینیم لە وێ بوو، کە منی بینی لە خۆشییاندا گەشایەوە، چاوەڕێی وەڵامی لێ دەکردم، وەڵامەکەش هەر خۆشەویستەکەی بوو، کە دەبوا بە دوای هاوارەکەی ئەوەوە ڕایبکردایە، وا دیار بوو کاتژمێرێک بەرلەوەی من بگەمە ئەوێ ناستینکا لەوێ ئامادە ببوو، لە سەرەتا زەردەی بە هەموو شتێ دەهات و بە هەموو شتێ پێدەکەنی، بە هەموو وشەیەک کە لە دەمم دەردەهات، من دەستم کرد بە قسەکردن بەڵام دواتر سامگرتی

بووم. ئەو گوتی:

– دەزانی من بۆ ئەوەندە خۆشحاڵم کە تەماشای تۆ دەکەم؟ بۆچی ئەمڕۆ ئەوەندە حەز بە تۆ دەکەم؟

دڵم کەوتە تەپە تەپ و گوتم:

– بۆچی؟

– بۆیە حەز بە تۆ دەکەم لەبەر ئەوەی نەکەوتیتە داوی خۆشەویستیمەوە، خۆت دەزانی هەندێ کەس ئەگەر لە جێگای تۆ بان ئەوا زۆر بێزار و نیگەرانیان دەکردم، هەر دەبا ئاهم بۆ هەڵکێشابان و زۆر بێتام دەبوون، لە کاتێکدا تۆ وا نی و بەڵکو زۆر خۆش و بەردڵی!

دواتر دەستەکانمی ئەوەندە گوشی، خەریک بوو هاوار بکەم، ئەوجا ئەو پێکەنی، خولەکێک پاشتر گوتی:

– ئای خوایە تۆ چ هاوڕێیەکی! خوا تۆی بۆم ڕەوانە کردووە، ئەگەر تۆ ئێستا لەگەڵم نەبوویای من چیم بەسەر دەهات؟! تۆ ئەو ماوەیە چەندە لەبەر من بێ ئارام بووی! چەندە یارمەتیت داوم! کاتێ کە شووم بەو کرد تۆ دەبیە باشترین هاوڕێم، زیاتر لەوەی خوشک و برا بین، چەندە یارمەتی ئەو دەدەم ئەوەندەش یارمەتی تۆ دەدەم.....

– تۆ زۆر هەست بە نیگەرانی دەکەی و دەترسی، وا بیر دەکەیەوە کە ئەو نایەت.

– ئای ئەزیزم! ئەگەر بینیت کە من دوێنێ دڵتەنگ بووم، ئەوە لە بێ باوەڕییەکەی تۆ و بێ هیوایییەکەی تۆوە بوو، هەر چەندە تۆ وات لێ کردم زۆر بیر بکەمەوە، بەڵام دواتر بیری لێ دەکەمەوە، ئێستا ئەو مافەت پێ دەدەم کە تۆ ڕاست دەکەی، بەڵێ من بە جۆرێک لەسەر خۆم





نیم و بە گومانم، بە جۆرێک وا هەست دەکەم شتەکان وەک پێشتر زۆر بێ بایەخ و سووکن، بەڵام بەسە! ئەوەندە وروژاندنی سۆز بەسە.....

لەو کاتەدا گوێمان لە دەنگی چەند هەنگاوی پێی کەسێک بوو، کە بینیمان لە تاریکیدا بەرەو لای ئێمە دێت، هەردووکمان هەڵسایین، ناستینکا خەریک بوو هاوار بکات، من دەستەکانیم بەردا و لە شوێنی خۆم جووڵام و وەک ئەوەی بڕۆم، بەڵام بە هەڵەدا چووبووین، ئەو نەبوو. ناستینکا دووبارە دەستەکانمی گرتەوە و گوتی:

– بۆچی دەترسی، بۆ دەستەکانت بەردام؟ دەی دەستەکانت بێنەوە، دەبێ بەیەکەوە چاومان پێی بکەوێ، دەبێ ئەو ئێمە ببینێ کە ئێمە چەندە شەیدای یەکترین.

بە دەنگێکی بەرز گوتم:

– ئێمە چەندە شەیدای یەکترین!

لە دڵی خۆمدا گوتم "ئای ناستینکا، ناستینکا، چەندە ئەو ڕستەیەت پێ گوتووم و دووبارە کردۆتەوە! ئاخر ئەم شەیدابوونە لە هەندێ ساتدا دڵ دەکاتە سەهۆڵ و ڕۆحیش قورس دەکات. ناستینکا، دەستەکانی تۆ وەک سەهۆڵ وان بەڵام هی من وەک ئاگر دەسووتێن، ناستینکا... ئای بۆ ئەوەندە کوێری و چاوت نابینێ! لە هەندێ ساتدا کەسی دڵخۆش و بەختەوەر چەندە خۆنەگرە! بەڵام من هیچم لەدەست نایەت لەوەی لێت تووڕەبم".

لە کۆتاییدا دڵم پڕ بوو گوتم:

– ناستینکا، گوێبگرە، دەزانی ئەمرۆ بە درێژایی ڕۆژ چۆن بووم؟

– چۆن بووی دە بڵێ، دە بڵێ بە خێرایی پێم بڵێ! بۆچی تا ئێستا

هیچت نەگوتووە؟

– ناستینکا، ئەوەی ڕاستی بێت، کاتێ کە هەموو ڕاسپاردەکانتم جێبەجێ کرد، نامەکەتم گەیاند و چووم تا هاوڕێ باشەکانت ببینم.... پاشان چوومە ماڵەوە یەکسەر بۆ ناو جێگا.

بە پیکەنینەوە گوتی:

– هەر ئەوەندەش؟

لەگەڵ ڕژاندنی چەند فرمێسکێکی گەوجانە کە پێشتر لە چاوما قەتیس مابوو وەڵامم دایەوە..

– بەڵێ هەر ئەوەندە، پێش کاتژمێرێک لە وادەی هاتنم بۆ ئێرە لە ناو جێگا هەڵسام لەگەڵ ئەوەشدا هیچ خەو نەچووبووە چاوم، نازانم چیم بەسەر هاتووە! وا هەست دەکەم کات وەستاوە، وا هەست دەکەم دەبێ یەک هەست تا هەتایە لە گەڵما بمێنێتەوە، وەک ئەوەی ژیانم خولەکێک بێ و تا هەتایە بەردەوام بێ، یا وەک ئەوەی ژیان بۆ من وەستابێت... کە لە خەو هەڵسام دەتگوت چەند پارچە مۆسیقایەکی بزوێنەری زۆر ئاشنا کە لە ڕابردوویەکی دوور و لەبیرکراو زۆر بە چێژەوە دەبیسترا، هاتبۆوە بەر سەراپای ژیانم، ئیستاش تەنها.....

ناستینکا منی پچڕاند و گوتی:

– ئای خوایە! ئەو هەموو شتانە مانای چییە؟ وشەیەک چییە تێناگەم...

بە دەنگێکی خەمناکەوە کە هێشتا هیوای لێ بەدی دەکرا گوتم:

– ئای ناستینکا، من بە هەر جۆرێک بێ دەمەوێ ئەو هەستە سەیرەی خۆمت بۆ بگێڕمەوە.





– ئەوەندە بەسە، بەسە...

لەپڕ زۆر بە سەیری قسەی دەکرد، دڵخۆش ببوو، هاروهاج ببوو، قۆڵی دەگرتم و پێدەکەنی، دەیویست منیش پێ بکەنم، هەر وشەیەکی پچڕ پچڕ کە من دەرم دەبڕی زیاتر درێژەی بە پێکەنینەکەی ئەو دەدا، هاتم توورەبم، بەڵام ئەو لە پڕ دەستی کرد بە شۆخی و گاڵتەکردن.

– دەزانی من هەستم بە ئەزیەت کرد لەوەی کە تۆ نەکەوتیتە داوی خۆشەویستی منەوە! تێگەشتن لە ناخی مرۆڤدا خۆ ئاسان نییە! بەڵام مرۆڤەکان هەموو وەک یەکن. بەڕێز دوورەپەرێز، نابێ سەرزەنشتم بکەی لەوەی کە من هەموو شتێک دەڵێم، هەموو شتێکی گەوجانە کە هاتۆتە ناو مێشکم.

هەر کە لە تاوەرێکی دوورەوە زەنگی کاتژمێرێک لێیدا گوتم:

– گوێ بگرە ئەوە کاتژمێر یانزەیە، باوەڕم وایە........

ئەو لە پڕ لە پێکەنینەکەی وەستا و یەک لە دوای یەک زەنگەکانی ژمارد لەو یانزە زەنگەی کە لە کاتژمێری تاوەرەکەوە دەهات، هەر کە زەنگی یانزەم لێی دا و گوتی:

– ئەوەش یانزە..

من پەشیمان بوومەوە لەوەی کە ترساندبووم، وام لێ کردبوو کە زەنگەکان بژمێرێ، نەفرەتم لە خۆم دەکرد کە ئەم ئارەزووە وەختییە بێزارکەرەم هەیە کە وام لێ کردبوو زیاتر هەست بە خەمباری بکات لەوەی ئەم شەو کاتژمێر یانزەشە کەچی هێشتا خۆشەویستەکەی نەهاتووە، داوای لێبووردنم لێ کرد، نەمدەزانی چی بکەم تا قەرەبووی ئەوە بکەمەوە کە کردبووم. دەستم کرد بە دڵنەواییکردنی، بە دوای

هۆکاری نەهاتنی خۆشەویستەکەی دەگەڕام، هەندێ لێکدانەوە و سەلماندنم بۆ کرد، لەو ساتەدا هیچ کەس ئەوەندەی ئەو بە ئاسانی هەڵنەدەخەڵەتا، لە ڕاستیدا هەرکەسێکی تریش بێت لەو ساتە پڕ لە چاوەڕوانییەدا گوێ لە هەموو دڵنەوایییەک ڕادەگرێ، ئەگەری سێبەری بەهانەیەکیش بە دیار بکەوێ ئەو دڵی پێ خۆش دەبێ، وەک دەڵێن کەسی لە ڕووبار کەوتوو ئەگەر پووشکەیەکیش ببینێ دەستی بۆ درێژ دەکات....

بە هۆی لێکدانەوە ڕوون و سەیرەکانم، بۆ جێبەجێکردنی ئەرکەکەم دەستم بە قسە کرد...

– دەزانی ئەمە کارێکی بێ مانایە، بۆ نەیتوانیوە تا ئێستا بێت، ناستینکا تۆ ئاڵۆز و شپرزەم دەکەی، تا منیش وەک تۆ کات لەدەست بدەم... بیر بکەوە! وا دانێ ئەو هێشتا نامەکەی پێ نەگەیشتووە، یا وا دانێ ناتوانی ئەمشەو بێت، یا ئەو دەیەوێ وەڵامی نامەکەت بداتەوە خۆت دەزانی ئەوەش تا بەیانی ناکرێت، هەر سبەی کە دونیا ڕووناک بۆوە من دەچم یەکسەر هەواڵیشت بۆ دێنمەوە، بێنە پێش چاوت ناستینکا، هەزاران لێکدانەوە و گریمان هەیە! لەوانەیە نامەکە گەیشتبێت، لە ماڵ نەبووبێت و تا ئێستاش نامەکەی نەخوێندبێتەوە، یا لەبەر هەر شتێکی تر بێت....

– بەڵێ بەڵێ، من بیرم لەم شتانە نەکردبۆوە، بێگومان شتێک هەر دەبێ هەبێت.

بە تۆنێکی وا درێژەی بە قسەکانی دا کە هیچ لارییەکی لە قسەکانمدا نەبوو، هەرچەند لەنێو قسەکانیدا هەستت بە نیگەرانییەکی تێکقژقژاو دەکرد. دواتر گوتی:





– ئێستا پێت دەڵێم کە دەبێ سبەی چیم بۆ بکەی، سبەی هەرچەندی زوو پێت دەکرێت دەچیت بۆ لای، ئەگەر هەر شتێکت بەدەست کەوت ئەوا منیش دەبێ بیزانم، خۆ دەزانی ماڵمان لە کوێیە؟

ئەو ناونیشانەکەی بۆ دووبارە کردمەوە، لە پڕ دیسان نەرم و بە پەرۆش بۆوە لەگەڵمدا، وا دیار بوو بە وردی گوێی لەو شتانە دەگرت کە پێم دەگوت، بەڵام کاتێ هەندێ پرسیارم لێ کرد بێ دەنگ و شپرزە بوو، ڕووی خۆی وەلا نا و تەماشای چاوەکانیم کرد...بەڵێ، دەگریا.. گوتم:

– بۆ دەگری، ئاخر بۆچی؟ ئای ناستینکا، چ منداڵانە و ناسکی! دەی مەگری دەی...

هەوڵی دا بخەنێ تا خۆی هێمن بکاتەوە، بەڵام هێشتا گەردەنی دەلەرزی و هەستت دەکرد کۆڵێک قورسایی لە سنگیدایە. پاش خولەکێک بێدەنگی گوتی:

– بیرم لە تۆ دەکردەوە، تۆ زۆر میهرەبانی، مەگەر من بەردبم هەست بەو هەستەی تۆ نەکەم! ئایا دەزانی من لەم بارودۆخەدا چیم لێ بەسەر هاتووە؟ من، هەردووکتان لەگەڵ یەکتری بەراورد دەکەم، بیر دەکەمەوە بۆچی ئەو تۆ نییە؟ بۆچی ئەو وەک تۆ نییە و وەک تۆ باش نییە، هەرچەندە کە ئەویشم لە تۆ زیاتر خۆش دەوێ؟

من هیچ وەڵامێکم نەبوو، بەڵام ئەو دەتگوت چاوەڕوانی ئەوەم لێ دەکات شتێ بڵێم. دواتر گوتی:

– بێگومان لەوانەیە لەبەر ئەوە بێت کە من هێشتا بە تەواوەتی لەو تێنەگەیشتبم، تۆ خۆت دەزانی من هەمیشە لێی ترساوم کە لە دەستی

بدەم، ئەو کەسێکی زۆر دڵسۆز و تێگەیشتوو بوو، دەزانم نەرمییەکی زۆر زیاتر لە دڵی ئەودا هەیە لەوەی لە دڵی مندا هەبێت....... لە بیرمە کاتێ کە خۆم کرد بە ژوورەکەیدا چۆن تەماشای کردم، تۆ لەبیرتە، بە خۆم و باولەکەم؟ بەڵام لەگەڵ ئەو هەموو شتانەش زیاتر ڕێزی دەگرم، ئایا ئەمە ئەوە نیشان نادا کە من و ئەو یەکسان نین بەڵکو ئەو زۆر لەمن باشترە؟

– نەخێر ناستینکا، نەخێر. ئەوە مانای وایە تۆ لە دونیادا ئەوت لە هەموو شت زیاتر خۆش دەوێ بگرە لە خۆشت زیاتر.

ناستینکا بە سادەیییەوە وەڵامی دایەوە:

– بەڵێ، وا دانێ کە وایە، بەڵام ئایا دەزانی چی نیگەرانم دەکات؟ من بە تەنها باسی ئەو ناکەم، بەڵکو بە گشتی قسە دەکەم، ئەو شتانە کەمێک بەر لە ئێستا هاتە ناو مێشکم، بۆچی ئێمە بەیەکەوە وەک خوشک و برا ناژین؟ بۆچی هەتا بگرە باشترین کەس وا دەردەکەوێ کە شتێ لە خەڵکی دەشارێتەوە و لە لای خۆی دەیهێڵێتەوە؟ بۆچی ئەوەی لە دڵماندایە ڕاستەوخۆ دەری نەبڕین، لە کاتێکدا دەزانین بەرامبەرەکانمان بێ مەبەست قسە ناکەن؟ هەروەک هەموو کەسێک دڵڕەقتر دەردەکەوێ لەوەی کە لە ڕاستیدا وایە، وەک ئەوەی هەموویان لە ناپاکی هەستەکانیان بترسن بەهۆی زوو دەربڕینیان.... خۆم لە قسەکانی هەڵقورتاند و گوتم:

– ناستینکا، ئەوانەی کە تۆ دەیڵێی ڕاستن، بەڵام ئەم هەموو شتانە هۆکاری زۆری لە دواوە هەیە.

لە کاتێکدا کە ئەو قسانەم دەکرد لە جاران زیاتر هەستەکانی خۆم کەپت کرد. ئەو بە هەستێکی قووڵەوە وەڵامی دامەوە و گوتی:





– نەخێر، نەخێر. بۆ نموونە تۆ وەک خەڵکی دیکە نیت! لە ڕاستیدا نازانم چۆن پێت بڵێم کە من هەست بە چی دەکەم، بەڵام بەلامەوە وا دیارە بۆ نموونە.....تۆ لەم ساتەدا ....لە پێناوی مندا شتێک دەکەیتە قوربانی.

ئەوەندەی بە شەرمەوە گوت و بە لاچاوێکیش چاوێکی لێ کردم.

بمبوورە کە وا دەڵێم، خۆت دەزانی من کچێکی سادەم، لە ژیانمدا کەم شتم بینیوە، بە ڕاستی هەندێ جار ئەو شتانەی کە دەمەوێ بیانڵێم، نازانم چۆن دەریان ببڕم!

ئەوەندەی گوت لە کاتێکدا لە دەنگیدا هەستێکی شاراوە و لەرزینێک هەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا دەیویست زەردەخەنە بکات.

– بەڵام من تەنها دەمەوێ ئەوە بڵێم کە سوپاسگوزارم و سوپاست دەکەم، هەروەها هەست بەم هەموو شتەش دەکەم کە....... ئای خوایە! داوا دەکەم خوا بەختەوەریت پێ ببەخشێ، ئەو شتانەش کە لە بارەی خەیاڵپلاوییەوە پێت گوتووم وا هەست دەکەم ئێستا وا دەرچووە کە ناڕاست بوون، مەبەستم ئەوەیە لە تۆدا ئەو شتە نابینم، تۆ جیاوازی لەگەڵ ئەو کەسەی کە وەسفت دەکرد، ئەگەر کەوتیە داوی خۆشەویستی کەسێکەوە، داوا دەکەم خوا لە گەڵیدا بەختەوەرت بکات! هیچ ئارەزووەکم لەو کەسە نییە کە خۆشت دەوێت تەنها ئەوە نەبێ کە ئەویش بەختەوەر بێ لەگەڵ تۆدا، دەزانم کە خۆم ئافرەتم، بۆیە دەبێ باوەڕم پێ بکەی کە وات پێ دەڵێم.

ئەو لە قسەکردندا وەستا و دەستەکانی زۆر بەگەرمی گوشیم. منیش نەمتوانی نەکەومە ژێر کاریگەری سۆزەوە، چەند خولەکێک تێپەڕی لە کۆتاییدا دەستەکانی هەڵگرت و گوتی:

– بەڵێ وا دیارە ئەمشەو نایەت، درەنگ داهات.

بە تۆنێکی قەناعەت پێکەرەوە گوتم:

– سبەینێ دێت.

ئەو بە بێ ئەوەی هەستی خەمباری پێشتری هەبێت گوتی:

– بەڵێ خۆشم وا هەست دەکەم کە تا سبەینە دانەیێ ناتوانێ بێ. باشە، تا بەیانی خوا حافیز، ئەگەر بووە باران لەوانەیە نەیەم، بەڵام دووسبەی دێم، بە دڵنیاییەوە دێم هەرچییەکیش ڕووبدات دێم، تۆش لێرە بیت و دەمەوێ بتبینم، هەموو شتێکم لێت دەوێت.

لەو کاتەی کە لە یەکتری جودا دەبووینەوە، دەستەکانی خستە ناو دەستم، بە متمانەیەکەوە تەماشای کردم و گوتی:

– هەمیشە لەگەڵ یەکتریدا دەبین، ئەی وانابێ؟

ئای ناستینکا، وای ئەگەر دەزانی ئێستا چەندە هەست بە تەنیایی دەکەم!

بۆ ڕۆژی داهاتوو، بەیانییەکەی کە کاتژمێر گەیشتە نۆ نەمتوانی لە ماڵ بمێنمەوە، سەرەڕای خراپی کەش و هەواش جلەکانم لەبەر کردو چوومە دەرەوە. لەو جێگایە دانیشتم کە شەوانە لێی دادەنیشتین، چوومە سەر کۆڵانەکەیان، هەرچەندە دوو هەنگاو لە دەرگاکەیان دوور بووم، هەستم بە شەرم کرد بە بێ ئەوەی تەماشای پەنجەرەشیان بکەم گەڕامەوە. زۆر بێزارتر لە ڕۆژانی تر گەڕامەوە ماڵەوە، چ ڕۆژێکی ناخۆش و بێزارکەر بوو! ئەگەر هاتوو ڕۆژێکی خۆش بووایە تا هاتنی شەو بۆ خۆم پیاسەم دەکرد.

ئەگەر ئەمشەویش نەیەت لەبەر خراپی کەش و هەوا، ئەوا سبەی





شەو دێت! سبەی شەو هەموو شتیکم پێ دەڵێت، هەرچەندە تا ئێستا وەڵامی نامەکە نەگەیشتووە، بەڵام دەبێ چاوەڕوانی بکەین. ئێستا نامەکە و خۆشەویستەکەی بەیەکەوەن....

# شەوی چوارەم

خوایە، ئەم ڕۆژە چۆن کۆتایی هات! کاتژمێر نۆی شەو گەیشتمە ئەوێ، ئەو بەر لە منیش لەوێ بوو، دیقەتێکی وردیم لێ دا، بینیم هەر وەک یەکەم شەو وەستاوە، ئانیشکەکانی لە سەر لێوی بەربەستە ستوونییەکە دانابوو و لە ئاوی ڕووبارەکە ڕامابوو، کاتێ کە لێی نزیک بوومەوە ئاگای لە دەنگی پێی هەنگاوەکانم نەبوو.. گوتم:

– ناستینکا !

زۆرم لە خۆم کرد تا نیگەرانییەکەم بشارمەوە، ئەو بە ئالۆزییەکەوە تەماشای کردم و گوتی:

– باشە، باشە؟ پەلە بکە..





بە پەشێوییەوە تەماشایەکیم کرد. ئەو زیاتر بە دەستەکانی بەربەرستە ئاسنینەکەی هەڵدەپشارد، گوتی:

– باشە، کوا نامەکە؟ نامەکەت هێناوە؟

– نەخێر، هیچ نامەم لا نییە، بۆ تا ئێستا ئەو نەهاتۆتە لات؟

لە ترسان ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا، بۆ ماوەیەکی درێژ بێ جووڵە تەماشای کردم، لەبەر ئەوەی من تاکە هیوا و دواهەمین هیوای ئەوم ورد و خاش کردبوو.

بە دەنگێکی پچڕ پچڕ و تێکشکاوەوە گوتی:

– باشە، حەواڵەی خوا بێ، ئەگەر بەم شێوەیە من بەجێ دێڵێ با حەواڵەی خوا بێ.

چاوەکانی بەردایەوە، دواتر ویستی تەماشام بکات بەڵام نەیتوانی، بۆ چەند خولەکێک لەگەڵ ناخیدا لە ململانێدا بوو، ئیتر لە پڕ ڕووی وەرگێڕا ئەولاتر و ئەنیشکەکانی دا پاڵ بەربەستە ستوونییەکان و دای لە پرمەی گریان. گوتم:

– ئاخ! نا نا مەگری، مەگری.

بەڵام کە تەماشای چاوەکانیم کرد نەمتوانی چیتر داوای لێ بکەم، ئاخر چیم پێ بگوتبا ؟ ئەو گوتی:

– هەوڵ مەدە دڵنەواییم بکەی، قسە دەربارەی ئەو مەکە و پێشم مەڵێ کە دێت و نایەوێ بەم دڵڕەقییە و بەم دڕندەییە بەڕێم بکات، هەروەک کردوویەتی. بۆچی؟ ئاخر بۆچی دەیەوێ وام لێ بکات؟ دەکرێ شتێک لە نامەکەی مندا هەبووبێ وای لێ کردبێ کە بێ وەڵام بێ، نامە بەدبەختەکەم؟.

لەم کاتەدا هەنسک بەری بەدەنگی گرتبوو، کە تەماشایم کرد دڵم خەریک بوو پارچە پارچە بێت، دەستی کردەوە بە قسەکردن و گوتی:

– ئای، ئەمە چەند نامرۆڤانەیە! یەک دێڕیشی بۆم نەنووسیوە، یەک دێڕ چییە، هەر بە لای کەم دەیتوانی دێڕێک بنووسێت و بڵێ کە منی ناوێت و ڕەتی کردوومەتەوە، کەچی ئەوە سێ ڕۆژە یەک دێڕی بۆ نەنووسیوم! چەند ئاسانە بۆ ئەو هەستی کچێکی بەستەزمانی بێ کەس بریندار بکات و سووکایەتی پێ بکات، تەنها هەڵەی ئەو کچە ئەوەیە ئەوی خۆش دەوێت! وای چەندە ئازارم خواردووە لەم سێ ڕۆژەدا! ئای ئازیزم، کاتێ کە بیردەکەمەوە کە من یەکەم جار چوومە لای و چەندە خۆم لە بەردەمیدا زەلیل نواند و گریام داوای کەمێک خۆشەویستیم لێ کرد......... لەگەڵ ئەوانەشدا، گوێ بگرە...

ڕووی تێ کردمەوە بینیم چاوە ڕەشەکانی دەبریسکانەوە، گوتی:

– نا وانییە... نابێ وابێ! یا تۆ بە هەڵەداچووی یا من، لەوانەیە ئەو نامەکەی پێ نەگەیشتبێ؟ لەوانەیە ئێستا هیچ شتێکی لە بارەیەوە نەزانیبێ، چۆن مرۆڤ لە خۆڕا بڕیار دەدات؟ بۆ خاتری خوا پێم بڵێ، بۆم ڕوون بکەوە من لێی تێناگەم! چۆن کەسێ دەتوانێ بەو جۆرە دڵڕەقییە و دڕندەییە ڕەفتار لەگەڵ کەسێکدا بکات، هەروەک ئەو لە گەڵ مندا کردوویەتی؟ یەک وشە چییە یەک وشە! بۆچی نزمترین و بێ نرخترین زیندەوەری دونیا عاشقانەتر لە من مامەڵەی لە گەڵدا دەکرێ؟ من دەڵێم لەوانەیە شتێکی بیستبێ، یا کەسێک شتێکی لە بارەی منەوە پێ گوتبێ.

بە گریان و ڕوویەکی تکاکارانەوە ڕووی لە من کرد:

– تۆ چی دەڵێی؟





– گوێ بگرە، ناستینکا، بەیانی بە ناوی تۆ دەچمە لای.

– ئێی، ئەوجا ؟

– هەموو پرسیارێکی لێ دەکەم و هەموو شتێکی پێ دەڵێم.

– بەڵێ، ئەوجا پاش ئەوە؟

– تۆ نامەیەک بنووسە، ناستینکا مەڵێ نایینووسم، وا مەڵێ، نا! وای لێ دەکەم ڕێزی کردارەکانت بگرێ و دەبێ هەموو ئەو شتانە ببیستێ، ئەگەر..........

ناستینکا قسەکانی پچڕاندم و گوتی:

– نا، هاوڕێم نا، ئەوەندە بەسە با چیتر نەڵێین، یەک دێڕی تر چییە من قسە ناکەم، ئەوەندە قسەکردن لەسەر ئەو بەسە! هەر ناشیناسم و چیتر خۆشم ناوێ. من..... لە یادی دەک ە...

نەیتوانی لە قسەکردن بەردەوام بێ، لەسەر جێگاکەدا دامنیشاند و گوتم:

– لێرە دانیشە، ئارامبەوە، ئارامبەوە ناستینکا.

– من ئارامم ئەزیەت مەخۆ، ئەوانە هیچ نین تەنها فرمێسکن و زوو وشک دەبن، بۆچی؟ وادەزانی شتێک بەسەر خۆم دێنم، خۆم دەخەمە ناو ڕووبارەوە؟

دڵم پڕ بوو، هەوڵم دا قسە بکەم بەڵام نەمتوانی. ئەو دەستەکانی گرتم و گوتی:

– گوێ بگرە، پێم بڵێ ئەگەر تۆ بای بەم جۆرە ڕەفتارت لەگەڵ دەکردم، ها؟ تۆ ئەو کچەت بە تەنها بەجێ دەهێشت کە هانای بۆ تۆ هێنابوو، یا بە ڕوویەکی گاڵتەجاڕانەوە وەڵامی ئەم دڵە گەمژە و بێ

هێزەیت دەدایەوە؟ یانیش چاودێریت دەکرد و هەستت دەکرد ئەم کچە تەنیایە و ناشزانێ چۆن چاودێری و پاسەوانی خۆی بکات لە خۆشەویستی تۆ، کە ئەوەش هەڵەی ئەو نییە؟......ئای ئازیزەکەم، ئازیزەکەم....

لە کۆتاییدا نەمتوانی دەست بەسەر سۆزی خۆمدا بگرم و بە دەنگێکی بەرز گوتم:

– ناستینکا تۆ ئازارم دەدەی، تۆ بریندارم دەکەی و دەمکوژی، ناستینکا من ناتوانم بێدەنگ بم! دەبێ قسە بکەم و ئەوەی لە ناو دڵمدایە هەڵیڕێژم !

کاتێ کە ئەو قسانەم کرد لە جێگای خۆم هەڵسامەوە، ئەو دەستەکانی گرتم و بە حەپەساوییەوە تەمەشایەکی کردم، دواتر گوتی:

– ئەوە چیت لێ بەسەر هاتووە؟

بە پێداگرییەوە گوتم:

– گوێ بگرە، ناستینکا، گوێم بۆ بگرە! هەموو ئەو شتانەی کە ئێستا پێت دەڵێم شتی بێمانان، ئەستەمن، گەمژانە و شێتانەن! من دەزانم ئەو شتانە هەرگیز نایەنە جێ، بەڵام ناتوانم بێدەنگ بم، لەبەر خاتری ئەوەی کە تۆ ئێستا لە پێناوی ئازار دەخۆی داوات لێ دەکەم پێش ئەوەی قسەکان بکەم بمبەخشی!

ئەو گوتی:

– چییە دە بڵێ؟ چییە؟

هەردوو چاوەکانی سڕییەوە و بە وردی سەیری دەکردم، لە کاتێکدا مەراقێکی سەیر لە نێو چاوە ئەبڵەقبووەکانیدا دەخوێنرایەوە:





– چی ڕووی داوە؟

منیش لەگەڵ جوولاندنی دەستەکانم، کە خەریک بوو بە قسە بێن. گوتم:

– هەرچەندە ئەستەمیشە، بەڵام من تۆم خۆش دەوێ ناستینکا، ئیتر تەواو، ئێستا هەموو شت گوترا! جا ئێستا دەبینی کە ئاخۆ دەتوانی گوێ لەوە بگری کە پێت دەڵێم.

ناستینکا قسەکانی پێ بڕیم و گوتی:

– باشە، پاشان چی؟ چیتر؟ من زانیم زۆر دەمێکە تۆ منت خۆش دەوێت، من وام بیر دەکردەوە کە حەزێکی سادە بێت، ئای...ئازیزم...

– لە سەرەتادا تەنها حەزێک بوو ناستینکا، بەڵام ئێستا! من لەو حاڵەتەدام کەوا تۆ تێیدابووی، کاتێ کە خۆت و باولەکەت خۆتان کرد بە ژووری ئەودا، بەڵکو بگرە حاڵەتێکی خراپتریش، ناستینکا لەبەر ئەوەی هەروەک ئەو چۆن گوێ بە هیچ نادا تۆش گوێ بە هیچ نادەی.

– ئەوە چی دەڵێی؟ هیچ تێناگەم! بەڵام بڵێ بۆچی ئەوەندە لە پڕ......ئای ئازیزم.... منیش قسەی بێمانا دەکەم... ئاخر تۆ.....

ناستینکا لە ئاڵۆزییاندا وەستا، کوڵمەکانی سوور هەڵگەڕان و چاوەکانی بەردایەوە.

– چی بکەین ناستینکا؟ من چی بکەم؟ منم دەبێ سەرزەنشت بکرێم، من هەڵسوکەوتی خراپم لە گەڵ کردووی... بەڵام نا، من نابێ سەرزەنشت بکرێم ناستینکا، من وا هەست دەکەم و وادەزانم کە نابێ سەرزەنشت بکرێم، چونکە دڵم پێم دەڵێ کە من لەسەر ڕاستیم، بۆیە ناتوانم هیچ ئازارت بدەم، ناتوانم هەستت بریندار بکەم، من هاوڕێت

بووم و ئێستاش هاوڕێتم، من خیانەتم لەو متمانەیە نەکردووە کە تۆ پێت داوم، ئەوەتا فرمێسکەکانم دەڕژێن ناستینکا، لێیان گەڕێ با بڕژێن، با بڕژێن، ئەوان کـــــەس ئازار نادەن، زوو وشک دەبنەوە ناستینکا.

ناستینکا ویستی دامنیشێنێ لە سەر کورسیەکەدا و گوتی:

– دانیشە دانیشە، ئای خوایە!

– نا ناستینکا، من دانانیشم، چیتر ناتوانم لێرەدا بمێنمەوە، جارێکی تر ناتوانی بمبینییەوە، من ئەوەی هەمە دەیڵێم و دەڕۆم، تەنها دەمەوێ بڵێم کە تۆ هەرگیز نەتزانیوە کە من تۆم خۆشویستووە، دەبوایە ئەو نهێنییەم لای خۆم هەڵگرتبایە، نەدەبووایە لەم ساتەدا بە خۆپەرستییەکەم نیگەرانت بکەم، نا ! بەڵام ئێستا ناتوانم زیاتر پێداگری بکەم، خۆت قسەت لەسەر ئەوە کرد، ئەوە هەڵەی تۆ بوو، بەڵێ هەڵەی تۆ نەک هی من، تۆ ناتوانی من لە خـــــۆت دوور بخەیتەوە.....

– نا، نا تۆ لە خۆم دوور ناخەمەوە نا!

کچەی بەستەزمان توانی بە باشترین شێوە ئەو پەشۆکاوییەی کە هەیبوو بیشارێتەوە.

– تۆ من لە خۆت دوور ناخەیتەوە؟ نا، من مەبەستم ئەوەبوو کە خۆم هەڵبـــێم لە لات، من دەڕۆم بەڵام دەبێ بەر لە ڕۆیشتن ئەوەی هەمـــە بیڵێم، لەبەر ئەوەی کە تۆ لێرە دەگریای، من لەبەر تۆ ئۆقرەم لەبەر بڕابوو. کاتێ کە دەگریایت و ئازارت دەخوارد، لەبەر ئەوەی (هەموو شتێ دەڵێم ناستینکا) لەبەر ئەوەی بەجێیان هێشتبووی، لەبەر ئەوەی





خۆشەویستیەکەت ئارەزوویەکی کاتی هەبوو، من هەستم کرد لە ناو دڵمدا خۆشەویستییەکی زۆر هەیە بۆ تۆ، ناستینکا، خۆشەویستییەکی زۆر زۆر! وا دیار بوو ئەگەر بەم خۆشەویستییە زۆرەم یارمەتی تۆم نەدابا، ئەوا زۆر بێ بەزەییانە بوو بۆم، لەوانە بوو دڵم بشکابا.... نەمتوانی بێدەنگ بم ناستینکا، دەبوایە قسە بکەم، بەڵێ، دەبوایە!

– بەڵێ، بەڵێ، ئەوەی هەتە پێم بڵێ، قسەم بۆ بکە، لەوانەیە پێت سەیر بێ من بەم شێوەیە قسەت لەگەڵدا دەکەم......قسە بکە، من پاشان شتی خۆم دەڵێم!

– لێم ببوورە، ناستینکا، بەسادەیی خۆت لێم ببوورە، هاوڕێی ئازیزم ئەو شتانەی کە دەشکێن چاک ناکرێتەوە، ئەو شتانەش کە دەگوترێن ناگەڕێنرێتەوە، ئەی وانییە؟ باشە ئێستا خۆت ئەوە دەزانی، ئەمە خاڵی دەستپێک بوو، زۆر باشە، هەموو شت تەواو، تەنها گوێ بگرە، ئەمڕۆ کاتێ کە دانیشتبووی دەگریای، وام بیرکردەوە (با پێت بڵێم بیرم لە چی دەکردەوە) وام بیرکردەوە (بێگومان نابێ وابێ ناستینکا) وام بیر کردەوە کە تۆ وازت لە خۆشەویستی ئەو هێناوە، پاشان بیرم کردەوە کە دوێنێ و پێرێ، بە دڵنیاییەوە توانیومە سەرکەوم لەوەی کە منت خۆش بووێ، خۆت دەزانی ناستینکا، خۆت گوتت کەوا خەریکە خۆشت دەوێم. باشە، ئیتر ئەوە هەموو ئەو شتانە بوو کە ویستم پێت بڵێم، هەموو ئەوەش کە ماوە ئەوەیە کە پێت بڵێم، چی دەبوو ئەگەر منت خۆشویستبایە، تەنها ئەوە و هیچی تر! گوێ بگرە هاوڕێم (بە هەر حاڵ تۆ هاوڕێمی) بێگومان من پیاوێکی هەژاری زەلیلم، خاوەنی هیچ دەرەنجامێکی گەورە نیم، بەڵام ئەوە مەبەستەکە نییە (وا نازانم بتوانم ئەوە بڵێم کە دەمەوێ، ناستینکا، لەبەر ئەوەی

زۆر ئالۆسکاوم) تەنها ئەوە نەبێ کە بڵێم زۆرم خۆش دەویستی، زۆر، بگرە تا ئەگەر هێشتا ئەویشت خۆشدەویست، بگرە تا بەردەوامیش بووای لەسەر خۆشەویستی ئەو کەسەی کە من نایناسم، دەبوایە لە هەر خولەکێکدا هەست بکەی کە لە تەنیشتتدا دڵێکی سوپاسگوزار، دڵێک بە کوڵ لێدەدات لە پێناوی تۆدا... ئاخ ناستینکا، چیت بە سەر هێنام!

ناستینکا بە خێرایی لەسەر جێگاکەی هەڵسا و گوتی:

– مەگری، نامەوێ بگری، وەرە هەڵسە لەگەڵم وەرە، مەگری.

بە دەستەسڕەکەی ئەسرینەکانی خۆی سڕییەوە.

– با بڕۆین، لەوانەیە شتێکت پێ بڵێم...... ئەگەر ئەو ئێستا منی بە تەنها جێهێشتووە! ئەگەر ئەو تا ئێستا منی لە بیر کردووە کەچی هێشتا هەر خۆشم دەوێ (نامەوێ هەڵتخەڵەتێنم)..... بەڵام گوێ بگرە و وەڵامم بدەوە، ئەگەر خۆشم ویستبای، بۆ نموونە ئەگەر من تەنها...... ئاخ هاوڕێم، هاوڕێم، هەست دەکەم چەندە بریندارم کردووی کاتێ کە بە خۆشەویستییەکەت پێکەنینم دەهات، بەوەی پیامهەڵدەدای تۆ ناکەویتە داوی خۆشەویستی من! ئای ئازیزم، نازانم چۆن بوو من پێشبینی ئەوەم نەدەکرد کە تۆ منت خۆش بوێ، نازانم چۆن بوو ئەوەندە گەوج بووم!؟ بە هەرحاڵ..... من بڕیاری خۆم داوە پێتی دەڵێم...

– سەیرکە ناستینکا، من دەڕۆم، بە جێت دێڵم، ئەوەی دەمەوێ بیکەم ئەوەیە، ئەگەر لێرە بم ئەوا تەنها ئازارت دەدەم، بۆ ئەوەش کە بە من پێکەنیوی، ئەوا پەشیمانی هەیە بۆ خۆت دواتر دەتوانی پەشیمان بیتەوە، ئیتر من تۆم ناوێ، بۆ خەمەکانیشت، بێگومان ئەوە هەڵەی





منە، ناستینکا، بەڵام من خواحافیز.

– بمێنەوە، گوێم بۆ بگرە، دەتوانی چاوەڕێ بکەی؟

– بۆچی چاوەڕوان بکەم؟ بۆچی؟

– من ئەوم خۆش دەوێ، بەڵام کۆتایی بەم خۆشەویستییەم دێنم، دەبێ ئەم خۆشەویستییە کۆتایی بێ، دەتوانم لە کۆتایی پێهێنانی سەرکەوم، هەست دەکەم دەتوانم..... کێ چوزانێ؟ لەوانەیە ئەمڕۆ کۆتایی بێ، لەبەر ئەوەی ڕقم لێی دەبێتەوە، لەبەرئەوەی لە کاتێکدا کە ئەو گاڵتەی پێ دەکردم، تۆ لێرە لە گەڵمدا دەگریای، لەبەر ئەوەی تۆ وەک ئەو ئارەزوویەکی کاتیت بۆ من نەبووە و خۆشت دەوێم، لە کاتێکدا ئەو هەرگیز منی خۆش نەویستووە، لە ڕاستیدا منیش تۆم خۆش دەوێ! هەر وەک تۆ منت خۆش دەوێ منیش تۆم خۆش دەوێ، لە پێشتریشدا ئەوەم زۆر پێ گوتووی، لەبەر ئەوە تۆم خۆش دەوێ چونکە لەو باشتری، لەو خانەدانتری، چونکە ئەو....

سۆز و عاتیفەی ئەوەندە زۆر ببوو، بەستەزمانەی نەیتوانی چیتر لەمە زیاتر بڵێت، سەری خستە سەرشانم دواتر خستیە سەر سنگم، بە کوڵ دەگریا، من دڵنەوایی دەکرد، بەڵام ئەو نەیدەتوانی لە گریان بووەستێ، زیاتر دەستمی دەگوشی، لە نێو هەنسکەکانیدا گوتی:

– چاوەڕێ بکە ئەم فرمێسکانە لە خولەکێکدا کۆتاییان دێ، دەمەوێ پێت بڵێم وا هەست نەکەی ئەم فرمێسکانە هیچ نین، ئەو فرمێسکانە بێ هێزی و لاوازین، چاوەڕێ بکە تا کۆتاییان دێت.

تا لە کۆتاییدا لە گریان وەستا، چاوەکانی سڕیەوە و بەردەوام بووینەوە لە ڕۆیشتن. من ویستم قسە بکەم بەڵام دیسان تکای لێ

کردم و پاڕایەوە کە جارێ چاوەڕێ بکەم.... ئێمە بێدەنگ بووین، تا لە کۆتاییدا ئازایەتی دایە خۆی و دەستی بە قسە کردن کرد.

– ئیدی بەم شێوەیە.

ئەمەی بە دەنگێکی بێ هێز و لەرزیووەوە گوت، کە تیایدا نۆتەیەکی تێدا بوو جەرگمی کون کون دەکرد.

– وا هەست نەکەی من ئەوەندە سووک و دەمەدەمەیم، وا هەست نەکەی من بە خێرایی خۆم لە بیر دەکەم و دەگۆڕێم، بۆ ماوەی ساڵێک ئەوم خۆشویست، سوێندیش بە خوا دەخۆم کە هەرگیز، هەتا بگرە لە هەستەوەش، بێ وەفا نەبوویمە بەرامبەری.... ئەو بووە کە ڕقی لە من بۆتەوە و بە من پێکەنیوە و گاڵتەی پێ کردووم، خوا بۆ خۆی بیبەخشێ! هەر ئەو بووە سووکایەتی بە من کردووە، دڵمی بریندار کردووە، من.... ئەوم خۆش ناوێ، لەبەر ئەوەی من تەنها دەتوانم ئەو کەسەم خۆش بوێ کە بەخشندەیە، میهرەبانە و لە من تێدەگات، ئەو بۆ من ئێستا هیچ نرخێکی نییە، باشە ئیتر ئەوەندە قسەکردن لە بارەی ئەو بەسە، ئەو ئەگەر بە چاوەڕوانیکردن هەڵی خەڵەتاندووم، ئەوا باش کارەکەی سەری گرتووە..... باشە کۆتایی هات، بەڵام کێ دەزانێ هاوڕێی ئازیزم....

ئەو بەردەوام بوو لە کوشینی دەستم.

کێ دەزانێ؟ لەوانەیە ئەو خۆشەویستییەی کە ساڵێکە هەمبووە، هەڵە بووبێت، تەنها وەسواس بووبێت، یا لەوانەیە لەبەر هەرەپاسیم و بێ مانایی بووبێ، یانیش لەبەرئەوە بووبێ کە لە لایەن داپیرمەوە بە ڕەقی مامەڵەم لەگەڵ کراوە! یا لەوانەیە پێویست بووبێت من کەسێکی ترم خۆش بوویێت نەک ئەو، بەڵکو کەسێکی جیاوازتر لەو کە بە زەیی





پیام بێتەوە..... با چیتر لە بارەی ئەوەوە نەڵێین.

ناستینکا لە قسە کردن وەستا، هەناسەبڕکێ ببوو، دواتر گوتی:

– من تەنها دەمویست پێت بڵێم.... دەمویست پێت بڵێم، ئەگەر هەرچەندە ئەویشم خۆش دەوێ (بەڵێ خۆشم دەوێ)، ئەگەر سەرەڕای ئەوەش کە گوتم.... ئەگەر هەست دەکەی خۆشەویستییەکەت ئەوەندە زۆر و گەورەیە کە لە کۆتاییدا دەتوانی هەستە کۆنەکە لە دڵمدا ڕیشەکێش بکەی، ئەگەر بەزەییت پێمدا دێتەوە، ئەگەر تۆ ئامادەبی منت خۆش بووێ هەروەک ئێستا منت خۆش دەوێ.... ئەوە دێیە داخوازیم؟

بە هەناسە بڕکێ و هەنسکدانەوە گوتم:

– ناستینکا، ئای ناستینکا!

ئەو بە زەحمەت توانی کۆنترۆڵی خۆی بکات گوتی:

– ئەوەندە بەسە، ئەوەندە، ئێستا هەموو شت تەواو، هەموو شت گوترا، وانییە؟ تۆ بەختەوەری و دڵخۆشی، منیش بەختەوەر و دڵخۆشم، هیچی تر لە بارەیەوە مەڵێ، دەرفەتم پێ بدە قسە دەربارەی شتێکی دیکە بکەم، بۆ خاتری خوا !

– بەڵێ ناستینکا، دەی با قسە دەربارەی ئەو بەس بێ، ئێستا من دڵخۆش و بەختەوەرم، بەڵێ ناستینکا بەڵێ، با قسە لەسەر شتی تر بکەین، دەی با پەلە بکەین و قسە بکەین، دەی من ئامادەم !

لە خۆشییاندا نەماندەزانی باسی چی بکەین! پێدەکەنین، دەگریاین، هەزاران شتی بێ مانا و بێ جێمان باس کرد، ساتێک لە سەر شۆستە پیاسەمان دەکرد، ئەوجارە دەگەڕاینەوە و بەسەر

شەقامەکەدا دەپەڕینەوە، پاشان دەوەستاین ئەوجارە دەگەڕاینەوە بۆ لای ڕووبارەکە، وەک منداڵ وابووین.

– من بەتەنیا دەژیم، ناستینکا، بەڵام بەیانی! بێگومان خۆت دەزانی ناستینکا من هەژارم، من تەنها (١٢٠٠) ڕۆبڵم هەیە، بەڵام گرنگ نییە.

– بێگومان ئەوە گرنگ نییە، داپیرم مووچەی خانەنشینی هەیە، ئەویش خۆی هیچ تەکلیفێکی ئەوەندە زۆری نییە، دەبێ لەو وەریگرین.

– بێگومان دەبێ لێی وەرگرین، بەڵام لەو لاوەش "ماترونا" هەیە.

– وایە، (فیوکلا) شمان هەیە لەولایە!

– ماترونا ئافرەتێکی زۆر باشە، بەڵام یەک کەم و کوڕی هەیە، ئەویش هیچ هەستێکی نییە، ناستینکا، هیچ هەستی نییە، بەڵام ئەوە گرنگ نییە.

– باشە ئەوان دەتوانن بە یەکەوە بژین، تەنها ئەوە ماوە سبەی تۆ ماڵت بگوازیەوە ماڵی ئێمە.

– بۆ لای ئێوە، چۆن؟ زۆر باشە من ئامادەم.

– تۆ ژوورێک لە لای ئێمە بە کرێ دەگری، لە نهۆمی سەرەوە بەتاڵە، کرێچییەکی ژنی بە تەمەنمان هەبوو بەڵام ئێستا ڕۆیشتووە، من دەزانم داپیرم حەز دەکات ئەمجارە کرێچییەکی گەنج بێ، من بە داپیرەم گوت "بۆچی پیاوێکی گەنج؟" ئەو گوتی "لەبەر ئەوەی من پیر بوویمە ناستینکا، هەست ناکەی دەمەوێ ئەوەی کە دێت، ببێتە مێردت؟" جا بۆیە هەست دەکەم ئەو لەگەڵ ئەو بیرۆکەیە دەبێ کە تۆ بێیتە ژوورەکەی سەرەوەمان.





– ئای ناستینکا!

بەیەکەوە پێکەنین ئەو گوتی:

– دەی ئەوەندە بەسە. تۆ لە کوێ دەژی، لە بیرم کردووە کە لە کوێ دەژی؟

– لەو ڕێگای سەرەوە، لە نزیک پردی (X)، باڵەخانەی "بارانیکۆف".

– خانوویەکی گەورەیە؟

– بەڵێ گەورەیە.

– دەزانم خانوویەکی خۆشە، بەڵام وا باشترە وازی لێ بێنی و چەندی زوو پێت دەکرێ بێیت بۆ لای ئێمە.

– بەیانی ناستینکا، هەر بەیانی دێم، کەمێک لە کرێیەکەم قەرزارم لەوێدا، بەڵام گرنگ نییە هەر بەم زووانە مووچەکەم وەردەگرم.

– ئایا دەزانی لەوانەیە دەرس بڵێمەوە، خۆم شتێ فێردەبم دواتر دەرس دەڵێمەوە.

– زۆر باشە! منیش هەر زوو سەرمووچەیەک وەردەگرم.

– ئەوجا لە بەیانییەوە دەبیتە کرێچی من.

– ئەوجا دەچینە شانۆی (سەرتاشەکەی ئیشبیلیە)، بەم زووانە دەست بە نمایشکردنەوەی دەکرێ.

– بەڵێ دەچین، بەڵام وا باشە شتێکی دیکە ببینین باشترە، نەک (سەرتاشەکەی ئیشبیلیە).

– باشە، شتێکی دیکە، بێگومان ئەوەیان باشتر دەبێ، من وا هەست ناکەم....

هەر کە بەو جۆرە قسەمان دەکرد، بە درێژایی ڕێگا دەتگوت وڕێنە دەکەین و سەرخۆشین، وەک ئەوەی نەزانین چیمان بەسەر دێ، ساتێک ڕادەوەستاین لە شوێنێک بۆ ماوەیەک قسەمان دەکرد، پاشان دەستمان دەکردەوە بە ڕۆیشتن، خوا دەزانێ دەچووین بۆ کوێ! هەمیسان دەگریاین و هەمیسان پێدەکەنینەوە، لە پڕ ناستینکا ویستی بچێتە ماڵەوە، من جورئەتی ئەوەم نەبوو زۆری لێ بکەم بمێنێتەوە، بەڵام ویستم لەگەڵی بڕۆمەوە تا دەگاتە ماڵەوە، بەڕێ کەوتین، لە چاریەکێکدا خۆمان لەو جێگەیە دۆزییەوە کە ئەو چەند شەوە لێی دانیشتبووین لە تەنیشت ڕووبارەکە. ناستینکا دیسان هەندێک ئاهی هەڵکێشا و فرمێسک لە چاوەکانی هاتە خوارەوە، من لە بێزارییاندا سارد بوومەوە... بەڵام ئەو دەستەکانمی کوشی و زۆری لێ کردم بڕۆم و هەر وەک پێشتر قسە بکەم ....

لە کۆتاییدا گوتی:

– ئێستا کاتی ئەوە هاتووە من بڕۆم، وا هەست دەکەم زۆر درەنگە، دەبێ واز لەو منداڵانەییەمان بێنین.

– وایە، ناستینکا، من لەوانە نییە ئەمشەو بخەوم و ناچمە ماڵەوە.

– وا هەست ناکەم منیش خەوم لێ بکەوێ، تەنها لە ماڵەوە دەبم ...

– منیش وا هەست دەکەم.

– ئەمجارەیان دەبێ بچینە ماڵەوە.

– دەبێ، هەر دەبێ بچینەوە ...

– شەرەف شتێکی دیارە؟ خۆت دەزانی لە هەندێ کاتدا مرۆڤ دەبێ بچێتە ماڵەوە!





بە پێکەنینەوە گوتم:

– شەرەف، شتێکی دیارە.

– ئێ چیتر !...

– چیتر، سەیری ئاسمان بکە ناستینکا، سەیرکە، سبەی دەبێتە ڕۆژێکی ئێجگار خۆش، ئاسمانێکی چەند شین و ڕوونە! چ مانگێکە وا بە ئاسمانەوە! تەماشاکە، ئا ئەو هەورە زەردە وا بەری پێ دەگرێ، تەماشاکە، تەماشا، ئەوا لێی تێپەڕ بوو، تەماشاکە، ناستینکا تەماشاکە!

بەڵام ناستینکا تەماشای هەورەکانی نەدەکرد، بە بێدەنگی وەک ئەوەی بووبێتە بەرد وەستابوو، خولەکێک پاشتر بە شەرمەوە خۆی بە منەوە نووساند، دەستەکانی لە ناو دەستمدا دەلەرزین، تەماشام کرد، زیاتر خۆی لێم نزیک کردەوە.

لەو ساتەدا گەنجێک بە لاماندا تێپەڕی، لە پڕ لە دواوە وەستا، بە وردی تەماشایەکی کردین، پاشان چەند هەنگاوێکی تر هاتە پێش، من دڵم کەوتە تەپە تەپ. بە دەنگێکی نزمەوە گوتم:

– ئەوە کێیە ناستینکا؟

ناستینکا بە ورتەیەکەوە وەڵامی دایەوە:

– ئەوە خۆیەتی.

ناستینکا زیاتر بە لەرزەوە خۆی بە منەوە نووساند، منیش زۆر بە زەحمەت توانیم لەسەر قاچەکانم بووەستم، دواتر لە دواوەی خۆمان دەنگێکمان بیست: " ناستینکا، ناستینکا ئەوە تۆی؟"

لە هەمان کاتدا چەند هەنگاوێک هات بەرەو لامان، خوایە!

ناستینکا چۆن هاواری کرد لە خۆشییاندا! چۆن بە پەلە دەستەکانمی بەردا و ڕای کرد بەرەو لای ئەو!

من وەستابووم سەیری ئەوانم دەکرد، بە تەواوی تێک شکابووم، بەڵام ناستینکا یەکسەر دەستی بۆ درێژ کرد، خۆی بە باوەشی دادا، لە کاتێکدا ڕووی وەرگێڕاوە لای من، لە چاو ترووکانێکدا هاتەوە تەنیشتە من، پێش ئەوەی بزانم لە کوێدام، ئەو هەردوو دەستی خستە ئەولا و ئەولای ملم و ماچێکی گەرم و نەرمی لێ کردم، پاشان بەبێ پێگوتنی هیچ وشەیەک، ڕایکردەوە لای ئەو، دەستەکانی ئەوی گرت و بە دوای خۆیدا بردی و ڕۆیشتن.

منیش ماوەیەکی درێژ وەستام تەماشایانم دەکرد، تا لە کۆتاییدا لەبەر چاوانم ون بوون.



## بەیانی

شەوم بە هاتنی بەیانی کۆتایی هات، ئەو بەیانییەی کە لە خەو هەڵسام ڕۆژێکی باراناوی بوو، باران بە شێوەیەکی خەمناک بە سەر شووشەی پەنجەرەی ژوورەکەم دەباری، لە ژوورەوە تاریک و لە دەرەوەش ڕەنگێکی لێڵی خۆڵەمێشی بوو. سەرم زۆر دەهێشا و گێژی دەخوارد، (تا) لە پەلوپۆی دابووم.

ماترۆنا بەسەرمدا نوشتایەوە گوتی:

– گەورەم نامەیەکت بۆ هاتووە، پۆستەچییەکە هێنای.

لەسەر کورسیەکەمدا یەک پێ قیت بوومەوە و گوتم:

– لە لایەن کێوە هاتووە؟

– نازانم گەورەم، وا باشترە تەماشای بکەی، لەوانەیە لێی نووسرابێ کە لە لایەن کێیەوەیە.

نامەکەم کردەوە، بینیم نامەکە لە لایەن ناستینکاوەیە. کە تیایدا نووسیبووی:

(بمبەخشە، بمبەخشە! بەچۆکدا دەکەوم لە پێشتدا تا بمبەخشی! من، تۆ و خۆشم هەڵخەڵەتاند، ئەوەی کە بوو خەونێک بوو، تراویلکەیەک بوو... ئەمڕۆ دڵم زۆر بۆت دەسووتێ، بمبەخشە، بمبەخشە! سەرزەنشتم مەکە، کە بەلای کەمیش دڵم بە لای تۆ نەهات و تۆم بە جێ هێشت، پێم گوتی کە تۆم خۆش دەوێ، ئێستاش تۆم خۆش دەوێ، زیاتریش لە جاران خۆشم دەوێی. ئای خوایە، ئەگەر دەکرا هەردووکتانم لە یەک کاتدا خۆشویستبا! وای ئەگەر تۆ ئەو دەبووی!

[ئای ناستینکا، یەکسەر ئەو ڕستەیەی تۆم بە بیرهاتەوە و لە گوێچکەمدا دەنگی دەدایەوە کە دەتگوت (وای ئەگەر ئەو تۆ دەبوو!)]

خوا دەزانێ ئێستا چیت بۆ دەکەم، دەزانم کە ئێستا غەمبار و مەست و بێزاری، من بریندارم کردووی، بەڵام خۆت دەزانی کاتێ کەسێک کەسێکی خۆشدەوێ، ئەوا زوو هەڵەکانی لە بیر دەکات، تۆش منت خۆش دەوێ.

سوپاست دەکەم، زۆر سوپاست دەکەم بۆ ئەو خۆشەویستییەت، کە وەک خەونێکی شیرین لە یادەوەریمدا دەمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی هەمیشە ئەوەم لە یاد دەبێ کە تۆ چۆن وەک برایەک و بە بەخشندەییەوە دڵی خۆت بۆ ئاوەڵا کردمەوە، ئامادەبووی دڵە وردوخاشبووەکەم چاودێری بکەی و چاکی بکەیتەوە. ئەگەر تۆش لە یادم بکەی ئەوا یادەوەرییەکانی تۆ هەرگیز لە ڕۆحمدا ناسڕێنەوە، ئەم





یادەوەرییانە وەک گەنجینە لە لای خۆم هەڵیان دەگرم و ڕاستگۆ دەبم بەرامبەریان، خیانەتیان لێ ناکەم، خیانەت لە خۆشم ناکەم، ئێستا دڵم زۆر جێگیرە، دوێنێ زۆر بە خێرایی و لەپڕ ڕووی کردەوە لای ئەو کەسەی کە هەمیشە ئەو خاوەنی بوو.

یەکتری دەبینین و چاومان بە یەکتری دەکەوێ، دەبێ بێی بۆ لامان، نابێ بە جێمان بێڵی، تۆ تاهەتایە دەبیت بە هاوڕێمان، بۆمن دەبیت بە برایەک. کاتێ کە دێی بۆ لام دەبێ دەستەکانتم بدەیتێ تا توند لە ناو دەستم بیانکوشم، باشە؟ دەبێ دەستەکانتم بدەیتێ لەبەر ئەوەی پێشتر ئەو دەستانەت پێ دابووم، وانییە؟ خۆشت دەوێم وەک جاران؟ نا؟ ئوووو، تکایە منت خۆش بوێ، لێم دوور مەکەوە، لەبەر ئەوەی لەم ساتەدا تۆم زۆر خۆش دەوێ، لەبەرئەوەی خۆشەویستی تۆ بە بەهادار دەزانم، چونکە من شایەنی ئەوەم ... ئازیزم، هەفتەی داهاتوو زەماوەندی گواستنەوەم دەبێ و مێردی پێدەکەم. ئەو بە خۆشەویستی گەڕاوەتەوە لای من و هەرگیز منی لە یاد نەکردووە، تۆ نابێ توورە ببیت کە لە نامەکەدا شتم لە بارەی ئەوە نووسیوە، بەڵام من دەمەوێ بێی و لەگەڵ ئەودا بتانبینم، تۆ حەز بە چارەی ئەو دەکەی، نا؟)

بمبەخشە

لە یادت بێ و خۆشت بوێ

" ناستینکای" خۆت

ئەم نامەیەم بۆ ماوەیەکی زۆر درێژ خوێندەوە، فرمێسک لە چاوانمدا بە خوڕ دەڕژانە خوارەوە، تا لە کۆتاییدا نامەکە لە دەستم کەوتە خوارەوە، ڕووی خۆم لێ لادا. ماترۆنا گوتی:

– بەڕێز، دەڵێم بەڕێز...

– چییە ماترۆنا؟

– دەڵێم هەموو تەونی جاڵجاڵۆکەکانم لە بنمیچەکەدا پاک کردۆتەوە، تۆ دەتوانی ئاهەنگی زەماوەند، یا هەر ئاهەنگێکی تری لێ ساز بدەی.

تەماشایەکی ماترۆنام کرد، هێشتا لاوێتی و نەرماتی ئافرەتانەی تێدا بەدی دەکرا، بەڵام نازانم لەبەر چی یەکسەر لەپڕ ئەوم وەکو چرایەکی کوژایەوە هاتە بەر چاو، بەدەموچاوێکی چرچ و لۆچ و قۆپاو و بەساڵاچوو... نازانم بۆچی لە پڕ وێنەی ژوورەکەم وەک وێنەی ماترۆنای پیر هاتە بەر چاو، دیوارەکان و فەرشی ژوورەکەم بێ ڕەنگ هاتنە بەر چاوم، دەتگوت هەموو شتی پیس و پۆخڵە و تەڵخی گرتووە، لە بەر چاومدا تەونی جاڵجاڵۆکەکان ئەستوورتر ببوون لە جاران، نازانم بۆچی کاتێ کە لە پەنجەرەکەدا تەماشایەکی خانووەکەی بەرامبەرم کرد، ئەمیش بەلامەوە دەتگوت کۆن و پۆخڵ بووە، دەتگوت دینگەکان و لەبغی دیوارەکان لە باریەک دەردێن و دادەڕووخێن و تارمەکانیش شەق دەبوون ڕەش دەبوون. دیوارەکان، دەتگوت بە ڕەنگی زەردی تۆخ پینە کراون.

جار جار تیشکی خۆر لە ژێر هەوردا سەرەدیقانێی دەکرد و بە دیار دەکەوت بەڵام دواتر بۆ چەند ساتێک لە ژێر هەوری ڕەش و پڕ لە باران ون دەبۆوە، کە تیشکی خۆر ون دەبۆوە دیسان هەموو شتێ لەبەر چاوم پۆخڵتر دەبۆوە، وابزانم تەواوی دیمەنی ئایندەم لە بەردەمدا وەک برووسکە بە خەمناکی تێدەپەڕی، لەوێشدا وا خۆم دیت کە هەر وەک ئێستا چۆن خۆم دەبینم، پاش پانزە ساڵی تر، پیرتر، لە هەمان ژوورم هەر بە تەنیاش، لەگەڵ هەمان ماترۆنا کە لەوە زیرەکتر نابێ.





بەڵام ناستینکا، وا هەست دەکەی بەرگەی ئەو خەفەتەت بگرم! وا هەست دەکەی هەوری خەم لە سەر ئارامی و بەختەوەرییەکەت لابدەم؟ یان بە تیر و توانجەکانم دڵت بکوشم و لە پەشیمانیدا ژەهردارت بکەم و دڵت وا لێ بکەم خۆزگە بخوازی بە ساتە خۆشەکان، یا یەک لەو جووتە گوڵانەت لێ ورد و خاش بکەم کە لە ڕۆژی بووکێنی کاتێ کە لەگەڵ ئەو دای لە ناو پرچتدا دەیبەستی.. ئای ناستینکا! نەخێر هەرگیز، هەرگیز وا ناکەم! داوا دەکەم هەمیشە ئاسمانت ڕۆشن و درەوشاوە بێ، داوا دەکەم هەمیشە زەردەخەنەی ئارامی لە سەر لێوانت بێ، داوا دەکەم خوا بەو ساتە بەختەوەرانە خەڵاتت بکات، کە بە کەسێکی تەنیا و سوپاسگوزارت دا.

خوایە، ساتە خۆشەکانی کەسێک چەندە کەمن بە قەدەر ژیانی کەسەکە!

کۆتایی

بەرواری ١٧– ١٨– ٢٠٠٧ تەواو بوو